پەیامەکانی گەنجان ٣٩

# قورئان و زانستی سەردەم

پێکەوە دەسازێن یاخود نا ؟



Qur'an AND MODERN SCIENCE

COMPATIBLE OR INCOMPATIBLE ?







نوسینی : د.زاکیر نایك

وەرگێڕانی: د.ئاراس و د. بێدار



پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان 


# قورئان و زانستی سەردەم

## پێکەوە دەسازێن یاخود نا؟

نووسینی: دکتۆر زاکیر نایک

وەرگێڕانی: د. ئاراس و د. بێدار

( ناسنامەی کتێب )

📖 ناوی کتێب:( قورئان و زانستی سەردەم پێکەوە دەسازێن یاخود نا ؟)

✍ نوسینی : دکتۆر زاکیر نایك

✎ وەرگێڕانی : ( د.ئاراس ) و ( د. بێدار )

* ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان ( ژمارە: ١١ )

* تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

* نۆبەی چاپ: یەکەم

* ساڵی چاپ: ٢٠١٦

* ژمارەی لاپەڕە : ١٠١لاپەڕە

* دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن

* نرخ تەنها : ( ٢٥٠٠ ) دینار

* سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد

* ئیمەیڵ: renwen٢٠٠٩@yahoo.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ( ٩٤ )ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

# ( پێشەکی )

## دەستەی بەچاپگەیاندنی زنجیرە کتێبەکانی ڕێنوین

هەردوو برای بەڕێز دکتۆر ئاراس و دکتۆر بێدار ئامادەییان دەربڕی کە کتێبی:

( The Quran and Modern Science, Compatible or Incompatible ? )

دکتۆر زاکیر نایك وەربگێڕنە سەر زمانی شیرینی کوردی، بۆ ئەوەی خوێنەرانی کورد لەو بەهرە گەورەیە بەشدار بن، برایانی دەستەی بەچاپگەیاندنی پەیامەکانی ئینستیتیوتی بانگخوازانیش ئامادەیی بەچاپگەیاندنی ئەو کتێبەیان دەربڕی، ئێمەش لە دەستەی ڕێنوین بۆ چاپ و پەخش داوامان لە بەڕێز مامۆستا ئیکرام کەریم کرد کە ئەو کتێبەمان بداتێ تا لە ریزی کتێبەکانی ڕێنویندا چاپی بکەین، چونکە دەستەیەکمان لە ناوەندی ڕێنوێن تەرخانکردووە بۆ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بەڕێز دکتۆر زاکیر نایك، ئەویش بەسوپاسەوە داواکەی

قەبوڵکردین، ئێمە جگە لە دوعای خێرمان بۆ مامۆستاو بۆ ئەو دوو برا وەرگێڕە بەڕێزەش ئەوە ڕائەگەیەنین کە هەر کەسێك بیەوێت نووسین یان وتارەکانی دکتۆر زاکیر وەربگێڕێتەسەر زمانی کوردی ئێمە ئامادەین بۆ چاپکردن و پەخشکردنەوەی بەبێ مەرج و داوا، ئەتوانن لەڕێگەی ژمارە تەلەفۆنی(٠٧٥٠١٢٦٩٦٨٩)(٠٧٥١١٤٠٨٨٦٨) وە پەیوەندیمان پێوەبکەن و لەسەر ئەو بابەتە ڕێبکەوین و هاوکارو هاریکاری یەکتر بین..

خوای پەروەردگار یارو یاوەری هەموو لایەکتان بێت .

دەستەی ڕێنوین بۆ چاپ و پەخش

٢٠١٦/٠١/٠١

## ناساندنێکی پێویستی دکتۆر زاکیر نایک

ناوی ( عبدالکریم نایك )ە ناسراوە بە ( دکتۆر زاکیر ) یاخود دیدادی گەورە ١٨ / ١٠ / ١٩٦٥ لە مۆمبای – هندستان لە دایك بووە، وە خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە بواری پزیشکی و نەشتەرگەریدا لە زانکۆی مۆمبای. لە ساڵی ١٩٩٣ وە سەرقاڵی بانگەوازە بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە هەریەك لە کتێبەئاینیەکانی { ئیسلام واتە قورئانی پیرۆز ، مەسیحیەت واتە ئینجیل ، یەهودیەت واتە تەورات ، هندۆسی و بوزیەکانی لە بەرە } وە بەڕێوبەری کەناڵی ئاشتی(PeaceTV)یە کە کەناڵێکی ئاشتی ئیسلامیەو زۆربەی کۆڕو دیبەیتەکانی لەم کەناڵەوە پەخشکراوە، ئەمە جگەلەوەی کە لە ڕێگای گۆڤار و کاسێتەوە چالاکیەکانی بڵاودەکرێتەوە. ئامانجی دکتۆر زاکیرنایك ئەوەیە کە چڕی فیکری گەنجانی موسوڵمان بخاتە سەر ئاینەکەی، بۆئەوەیوا هەست نەکەن کە ئاینەکەیان کۆنەپەرستەو ببێتە شتێك بۆیان کەشەرمی پێوە بکەن لە جیاتی شانازی ، دکتۆر زاکیرنایك بەزانای گەورەی ئیسلامی شێخ ئەحمەد دیدات سەرسام بووەو قوتابی شێخ ئەحمەد دیدات

بووه، لـــه تەمەنی ( ٢٢ ساڵی )دا و لە ساڵی (١٩٨٧ )ی زاینی پێی ئاشنا بووەو بەدیداری شادبووە .

بۆچوونی زاکیر نایك سەبارەت بە ئیسلام :

ئاینی ئیسلام ئاینێکی (مەنطقی)یەو لەگەڵ بیروهزری مرۆڤدا دەگونجێت وە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤی تێدایە .

بۆ نمونە/ لە قورئانی پیرۆزدا زیاد لە ( ١٠٠٠ )ئایەتمان هەیە کە ئایەتی زانستین و، زانست تازە پێیگەیشتووە لەوانەش زانستی کۆرپەلەزانی .

وە دەڵێت موسوڵمانان بەردەوام لە زیاد بووندان، وە خودای گەورە لە پشتمانە و نمونە دەهێنێتەوەو دەڵێت: لە مانگی ٩ی ٢٠٠١ تا مانگی ٧ی ٢٠٠٢ واتە لە دوای ڕووداوەکەی ١١ی سێپتەمبەرەوە، واتە لەماوەی ٩مانگدا زیاد لە ( ٣٤ )هەزار ئەمەریکی موسوڵمان بوون، وە ( ٢٣ )هەزاریش لە ئەورووپا موسوڵمان بوون .

کەناڵی (پیس تیڤی) کە کەناڵی (دکتۆر زاکیرنایك)ە ئەم کەناڵە لە ساڵی ( ٢٠١٢ ) لە وڵاتی هندستان پەخشکردنی قەدەغەکراوە، وە خودی خۆیشی لە ساڵی ( ٢٠١٠ ) وڵاتی بەریتانیای لێ قەدەغەکراوەو ناتوانێت بچێتە ناو ئەو وڵاتەوە .

وەبۆچوونی دکتۆر زاکیرنایك سەبارەت بە تیرۆرست:
وە دەڵێت ئەگەر جەنگان دژی دوژمنانی ئیسلام تیرۆر بێت ئەوا هەموو موسوڵمانان تیرۆرستن، بەڵام بەپێی بەڵگەی قورئان هەرکەسێك بێتاوانێك بەبێ هیچ هۆکارێك بکوژێت ئەوە وەك ئەوە وایە کە هەموو مرۆڤایەتیت کوشتبێت .
دکتۆر زاکیر نایك، وەك بانگخوازێکی بەتوانای جیهانی بۆ ئاینی ئیسلام و بەراوردی ئایینەکان ناوبانگی دەرکردووە. سەرۆکی دامەزراوەی توێژینەوەی ئیسلامییە لە مۆمبای لە هیندستان.
دکتۆر زاکیرنایك ئاینی پیرۆزی ئیسلام ڕوون دەکاتەوە و هەڵەتێگەیشتنەکانی سەری لادەبات، ئەوەش بە بەکارهێنانی قورئان و فەرموودە دروستەکان و دەقی ئاینەکانی تر وەك بنچینەیەك، هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی لۆجیك و ڕاستییە زانستییەکان. وە ناسراوە بە شیکردنەوە جوانەکانی و وەڵامە قەناعەتپێکەرەکانی بۆ ئەو پرسیارە بەهێزانەی کە لەلایەن گوێگران و ئامادەبووانی وتارەکانییەوە لێی دەکرێت.
لەماوەی ٢٠ ساڵی ڕابردوو، دکتۆر زاکیرنایك زیاد لە ٢٠٠٠ وتاری پێشکەشکردووە بۆ وڵاتانی ئەمریکا، کەنەدا، بەریتانیا، سکۆتلەندا، ئیتاڵیا، فەڕەنسا، سعودیە، ئیماڕات، کوێت، قەتەر،

بەحرەین، عومان، میسر، ئوسترالیا، نیوزلەندا، ئەفریقای باشور، نایجێریا، غانا، گامبیا، مەغریب، جەزائیر، ئیندۆنیسیا، مالیزیا، سەنگاپورە، تایلەند، هۆنگ کۆنگ، چین، سریلانکا و چەندین وڵاتی تر. وە چەندین وتاری جیهانیی لە هیندستان پێشکەشکردووە. لە مانگی ٣ی ٢٠١٢دا لە هیندستان وتارێکی پێشکەشکرد کە زیاتر لە یەك ملیۆن کەس ئامادەی بوو، وە بوو بە یەکێك لە گەورەترین کۆبوونەوەی ئاینی لە جیهاندا کە لەلایەن یەك بانگخوازەوە پێشکەشکرابێت.

لەناو زیاتر لەبلیۆنێك کەس لە هیندستاندا، دکتۆر زاکیرنایك کەسی ژمارە ٨٢ بوو لەنێوان بەهێزترین ١٠٠ کەسایەتی هیندستاندا کە ڕۆژنامەی ئیکسپرێسی هیندی لەساڵی ٢٠٠٩ دا بڵاوی کردەوە و لەساڵی ٢٠١٠دا بوو بە ژمارە ٨٩.

لەساڵی ٢٠٠٩دا سێهەم بەهێزترین وتاربێژی ڕۆحی هیندستان بوو لە نێوان ١٠ کەسایەتیدا، وە لەساڵی ٢٠١٠دا بوو بە یەکەم. وە لەسەرووی لیستی ٧٠ کەسەوەبوو لەنێوان ٥٠٠ کاریگەرترین موسوڵمان لە جیهاندا کە لە زانکۆی جۆرج تاون لێکۆڵینەوەی لەسەرکرا لە ئەمریکا، لەساڵانی ٢٠١١، ٢٠١٢، ٢٠١٣/٢٠١٤ وە٢٠١٤/٢٠١٥.

وە خەڵاتە بەناوبانگەکانی خەڵاتی کەسایەتی ئیسلام لە ساڵدا، بۆ ساڵی ( ٢٠١٣ ) پێ بەخشراوە .

وە خەڵاتی مەلیك فەیسەڵی جیهانی بۆ خزمەتکارانی ئیسلامی لە ٢ / ٢ / ٢٠١٥ پێ بەخشراوە .

بە سەرکەوتوویی بەشداری کردووە لە چەندین کۆڕ و گفتوگۆدا لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی بەناوبانگی ئایینەکانی تردا. لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ ( ولیان کام پێل ) Wilian Campbellلەژێر ناونیشانی ' قورئان و ئینجیل لەژێر تیشکی زانستدا' کە لە ١ی مانگی ٤ی ٢٠٠٠دا لە شیکاگۆ لە ئەمریکا بەڕێوەچوو، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا. وە لە گفتوگۆیەکی تردا لەگەڵ بانگخوازی بەناوبانگی ئاینی هیندۆسی Sri Sri Ravi Shankarکە لە ٢١ی ١ی ٢٠٠٦ دا لەژێر ناونیشانی 'زاراوەی خودا لە ئاینی هیندۆسی و ئیسلامدا لەژێر ڕۆشنایی دەقە پیرۆزەکاندا' لە هیندستان ئەنجامیدا، زۆربەرز نرخێنرا لەلایەن پەیڕەوانی هەردوو ئاینی ئیسلام و هیندۆسییەوە.

## ١. پێشەکی....

لەوکاتەوەی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەم هەسارەیە دەستی پێکردووە، مرۆڤ هەمووکات هەوڵی داوە لە سروشت و شوێن و پلە و پایەی خۆی لە سیستمی دروستکراوان و ئامانجی ژیانی تێبگات، لە گەشتی گەڕان بە دوای ڕاستییەکاندا بەدرێژایی چەندەها سەدە و شارستانییەتی هەمەچەشن، دامەزراوە ئایینییەکان بەدرێژایی مێژوو و بۆماوەیەکی زۆر شێوازی ژیانی مرۆڤیان دیاریکردووە.

لەکاتێکدا هەندێك لە ئایینەکان پشت بەدەقی نوسراو دەبەستن کە شوێنکەوتوانی وای دادەنێن کە سروشی ئاسمانی بێت، وە هەندێکی تریشیان تەنها پشت بە ئەزموونی مرۆڤەکان دەبەستن.

قورئان، کە سەرچاوەی سەرەکی بیروباوەڕی ئسلامییەموسوڵمانەکان بڕوای تەواوەتییان بەوەهەیە کە سروشێکی ئاسمانییە، هەروەها بڕوایان وایە کە ڕێنمونیکارە بۆ هەموو مرۆڤایەتی.

کە پەیامی قورئان بۆ هەموو کات و سەردەمێك بێت دەشبێت بۆ هەموو سەردەمەکان گونجاو و شیاو بێت!

بەڵام ئایا قورئان توانیویەتی لەم تاقیکردنەوەیە سەرکەوتووبێت؟

مەبەستی من لەم پەرتووکە ئەوەبوو کە شیکاری بابەتییانە بکەم بۆ بیروباوەڕی موسوڵمانان دەربارەی دروستی و سروشی بوونی قورئانی پیرۆز بەتایبەتی لەژێر ڕۆشنایی دۆزینەوە و بەڵگە زانستییەکاندا.

سەردەمانێك لە مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتی ((معجزە))[1] یان ئەوانەی وا دائەنران ( معجزة ) بن گرنگییەکی زۆریان پێدەدرا لە لۆژیك ئاوەزی مرۆڤەکاندا!

بێگومان پێناسەیەکی سادەی (معجزە) بریتییە لە هەرشتێك کە ڕوودەدات لە دەرەوەی چوارچێوەی ڕێڕەوی ئاسایی ژیان، وە مرۆڤایەتی هیچ لێکدانەوەیەکی بۆی نەبێ.

---

[1] دیارە کە (معجزة) وشەیەکی عەرەبییە و لەبەرامبەریدا لە کوردیدا وشەی (پەرچوو) بەکاردەهێنرێت. ((وەرگێڕ))

بەهەرحاڵ، پێویستە وریابین پێش ئەوەی هەر شتێك بە معجزە دابنێین.

لە ساڵی ١٩٩٣دا لە گۆڤاری (The times of india) لەشاری مۆمبای هیندا ڕاپۆرتێکی نوسیبوو لەسەر قەشەیەك بەناوی بابا پایلۆت (Baba pilot) کە بۆماوەی سێ شەوی یەك لەدوای یەك لەناو بەرمیلێك ئاودا ماوەتەوە! بەڵام کاتێك ڕۆژنامەنوسان ویستیان بەرمیلە ئاوەکە تاقیبکەنەوە و بیپشکنن کە ئەو دەیوت بۆ ماوەی سێ شەو لەناویدا ماوەتەوە و ئەم کارە معجزە ئاسایەی تێدا ئەنجامداوە، کەچی نەیهێشت ڕۆژنامەنوسەکان ئەوکارە ئەنجامبدەن! مناقەشەی دەکرد و دەیوت چۆن دەکرێ سکی دایکێك بپشکنرێ کە منداڵی بووە؟! بەڕوونی دیاربوو کە قەشەکە خۆی لە شتێك دەدزییەوە. ئەوکارەی تەنها ڕێگایەك بوو بۆئەوەی ناوبانگ پەیدابکات. بێگومان هیچ کەسێکی ئەم سەردەمە کە یەك تۆز بیربکاتەوە "معجزە"ی ئاوا پەسند ناکات!

ئەگەر ئەم معجزە درۆیینانە بەڵگەبن لەسەرئەوەی ئەمانە لەلایەن خواوە هاتوون، ئەوە دەبێ بڕوا بەهەرچی جادووگەرە

بەناوبانگەکانی جیهان بکەین، چونکە سیحر و جادووی زۆر بلیمەتانە دەکەن! خۆ ناکرێ بە "پیاوی خودا" لەقەڵەم بدرێ!

کاتێک بانگەشەی ئەوەدەکرێ کە پەرتووکێك سروشتی ئاسمانییە، تەنها بانگەشەکە بەس نیە بەڵکو دەبێ بانگەشەکە لە هەموو سەردەمێکدا بسەلمێنرێت بەگوێرەی پێوەرەکانی ئەم سەردەمە، موسوڵمانان بڕوایان وایە کە قورئان کۆتا پەیام وسروشی خوایە، معجزە ی معجزە کانە! وەك ڕەحمەتێك بۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووە! دەی با ئێمەش ڕاستییەتی ئەم بانگەشە و بیروباوەڕە تاقیبکەینەوە.

قورئان بەرەنگاری ڕادەگەیەنێت:

هۆنراوە و وێژە هۆکارێك بوون بۆ دەربڕینی هەستی کرۆڤ و نیشاندەری بەهرە و کارامەیی مرۆڤ بووە لە هەموو کلتورێکدا، جیهان شایەتی سەردەمانێك دەدات کە هۆنراوە و وێژە گەیشتبوونە ترۆپکە و لوتکە هەروەك چۆن ئێستا زانست و تەکنەلۆجیا لەوپەڕی لوتکەدایە.

تەنانەت زانا ناموسوڵمانەکانیش کۆکن لەسەرئەوەی کە قورئان دەقێکی وێژەیی عەرەبی بێهاوتا و ناوازەیە! و باشترین وێژەی

عەرەبییە لەسەر زەوی، قورئان ڕوو لەمرۆڤایەتی دەکات و بەرەنگارییان دەکات کە شتێکی وەکو قورئان دابهێنن:

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة .

واتە : جا ئەگەر ئێوە لەدوودڵیدان و گومانتان هەیە لەم (قورئانەپیرۆزە)ی کە بۆسەر بەندەی خۆمان (محمد) دامانبەزاندووە، ئەگەر ئێوەش دەتوانن هەوڵدەن سورەتێکی وەك ئەوە بهێنن هاوپەیمانان و هاوکارەکانیشتان جگە لەخوا(بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ڕاستدەکەن، خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیزیش ناتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن) و خۆتانبپارێزن لەوئاگرەی کە سوتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە کە بۆ بێباوەڕ و خوانەناسان ئامادەکراوە.

ئەم بەرەنگارییەی قورئان بۆ دانان و بەرهەمهێنانی تاکە سورەتێك بوو وەك سورەتەکانی قورئان، هەمان بەرەنگاری چەندەهاجار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، دروستکردنی سورەتێ: کە لە جوانی و ڕەوانبێژی و قوڵی مانا کە لایەنی کەم

کەمێك لە سورەتەکانی قورئان بچێت تا ئەمڕۆش دەستەبەر نەبووە!

بەڵام هەرگیز پیاوێکی هۆشیاری سەردەمییانە باوەڕ بە پەرتوکێکی ئاینی ناکات هەرچەندە بە جوانترین شێوازی وێژەش ئەوە بڵێ کە (زەوی تەختە)! چونکە ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە مرۆڤ پشت بە هۆکار و زانست و لۆژیك دەبەستێت.

زۆرکەسهەیە کە زمانە جوان و نائاساییەکەی قورئان وەکو بەڵگە وەرناگرێت بۆ ئاسمانیبوون و سروشیبوونی قورئان! هەر پەرتوکێکی پیرۆز بانگەشەی ئەوەبکات کە سروشی ئاسمانییە دەبێ لە ڕوانگەی لۆژیکییەوە پەسندبکرێت! بەپێی زانای بەناوبانگی فیزیا (ئەلبێرت ئەنیشتاین) کە خاوەنی خەڵاتی نۆبلە دەڵێت :

(( زانست بەبێ ئاین زانستێکی شەلە و ئاینیش بەبێ زانست ئاینێکی کوێرە))

دەبا ئێمەش لە قورئان بکۆڵینەوە و بزانین ئایا قورئان لەگەڵ زانستی سەردەم گونجاوە یان نا؟

قورئان پەرتوکێکی زانستی نیە بەڵکو پەرتوکی نیشانە یان هێماکانە واتە پەرتووکی ئایەتەکانە! زیاتر لە شەش هەزار ئایەت و نیشانە لە قورئاندا بوونیان هەیە، و زیاد لە هەزار دانەی باس لە ناوەرۆك و کاکڵەی زانست دەکات!

چەندین جار زانست یو–تێرن (U-turn)ی کردووە![1]

من لەم پەرتووکەدا ڕەچاوی ڕاستییە زانستییە چەسپێنراوەکانم کردووە نەك گریمانە و تیۆری کە لەسەر بنچینەی زانستی دانەمەزراون و پشت ئەستورنین بە بەڵگەی زانستی.

---

[1] مەبەستی دکتۆر زاکیر ئەوەیە کە چەندەها جار زانست بەگوێرەی بیردۆزەکان چەند شتێکی بۆدەرکەوتووە کە بۆ ماوەیەکی زۆر وەك ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر دانراوە بەڵام پاش ماوەیەك هەر بە بەڵگەی زانستی هەڵوەشێنراوەتەوە، لەمانەدا زانست یو–تێرنی کردووە بەڵام ئەو بەڵگانەی کە دکتۆر زاکیر لەم پەرتووکەدا پەلکێشی کردوون چەند بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی زانستین نەك تەنها گریمانە و بیردۆزبن. ((وەرگێڕ))

## ٢.ئەستێرەناسی....

## دروستبوونی گەردوون ((تەقینەوە گەورەکە))

بەدیهێنانی گەردوون لای زانایانی ئەستێرەناسی فیزیاییەوە وەك دیاردەیەکی تا ڕاددەیەکی زۆر پەسندکراو دانراوە کە بە (تەقینەوە گەورەکە) ناسراوە، کە بەکۆمەڵێك بەڵگە و داتای بەرجەستە و تاقیکراوە پشت ڕاست کراوەتەوە کە بۆماوەی دەیەها ساڵ لەلایەن زانایانی ئەستێرەناسی و فیزیاییەوە کۆکراونەتەوە.

بەگوێرەی تەقینەوە گەورەکە، هەموو گەردوون لەسەرەتادا بریتیبووە لە بارستاییەکی گەورە (وەکو پەڵە هەورێکی چڕ) کە پێی دەوترێ (Primary nebula) پاشان (تەقینەوەگەورەکە) ڕوویداوە (لێکجیابوونەوەی دووهەمیی) کە بووەتە هۆی دروستبوونی گەلە ئەستێرەکان (Galaxies). پاشان ئەم گەلە ئەستێرانە دابەشبوون تا ئەستێرەکانیان دروستکرد و دواتریش هەسارەکان و خۆر و مانگ ...هتد. بنچینە و سەرەتای

گەردوون زۆر بێهاوتا و ناوازە بووە، و هەرگیز ناکرێ ئەم ڕووداوە بەڕێکەوت لێکبدرێتەوە!

قورئانی پیرۆز چەند ئایەتێکی تێدایە دەربارەی سەرەتای دروستبوونی گەردوون :

﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء،واتە : ئایا ئەوانەی بێباوەڕن بۆیان ڕوون نەبۆتەوە کە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچەبوون لەوەودوا لێکمانجیاکردنەوە؟

ناکرێ ئەم لێکچوونە گەورەیەی نێوان قورئان و دیاردەی تەقینەوە گەورەکە پشتگوێ بخرێت! چۆن چۆنی دەگونجێت کە پەرتوکێك ١٤٠٠ ساڵ کە لە بیابانەکانی عەرەبستاندا دەرکەوت ئاوها ڕاستییەکی زانستی قوڵی تێدابێت؟!

**بارستییە گازییە سەرەتاییەکان پێش ئافراندنی گەلە ئەستێرەکان:**

زانایان کۆکن لەسەرئەوەی کە پێش دروستبوونی گەلە ئەستێرەکان، ماددەیەکی گەردوونی هەبووە کە سەرەتا لەسەر شێوەی (گاز) بووە. بەکورتی، ماددەیەکی گازی زەبەلاح یان پارچە هەورێکی گەورە لە پێش دروستبوونی گەلە ئەستێرەکاندا (Galaxies) بوونی هەبووە، وە بۆ وەسفکردنی ئەم ماددەگەردوونییەش وشەی ((دوکەڵ)) زۆر شیاوتر و گونجاوترە لە وشەی (گاز). ئەم ئایەتەی خوارەوەش باسی ئەم دۆخەی گەردوونمان بۆدەکات و وشەی (دخان) واتە دوکەڵ بەکاردەهێنێت :﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾فصلت،واتە : پاشان ویستی ئاسمان رێکبخا و دروستی بکات لەکاتێکدا دوکەڵ بوو، بە ئاسمان و زەوی فەرموو : فەرمانبەردار و ملکەچ بن، بەویستی خۆتان یان بەزۆر بتانخەمە ژێر فەرمانی خۆمەوە؟ هەردوولا خێرا وتیان : ملکەچی تۆین و چۆن بتەوێ ئاوها دەکەین.

ئەم ڕاستییەش دەرئەنجامی تەقینەوە گەورەکەبوون، کە پێش هاتنی پەیامبەر محمد (ﷺ)[1] کەس نەیزانیون، دەی کەواتە دەبێت سەرچاوەی ئەم زانیارییانە لەکوێوە هەڵقوڵابێتن؟!

**شێوەی زەوی گۆییە:**

لەڕابردوودا خەڵکی بڕوایان وابوو کە زەوی تەختە! بۆ چەندین سەدە مرۆڤ دەترسا لەوەی سەرکێشی بکات و زۆر دووربکەوێتەوە لەترسی ئەوەی نەوەك لە لێواری زەوی بکەوێتە خوارەوە. بەڕێز (Francis Drake) یەکەم کەس بوو کە سەلماندی زەوی گۆییە کاتێك گەشتێکی دەریایی بەدەوری زەویدا ئەنجامدا لە ساڵی ١٥٩٧ دا، لەم ئایەتەی خوارەوە تێڕابمێنە و وردبەوە کاتێك باسی ئاڵوگۆڕی نێوان شەو و ڕۆژ دەکات :

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ...﴿٢٩﴾﴾ لقمان .

واتە : ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا شەو تێکەڵکێشی ڕۆژ دەکات و ڕۆژیش تێکەڵکێشی شەو دەکات.

---

[1] موسڵمانان درود و سەلام بۆ هەموو پێغەمبەران دەنێرن لەکاتی ناوهێنانیاندا.

(یولج) یاخود تێکهەڵکێشکردن واتە شەو لەسەرخۆ و هێدی هێدی دەبێت بە ڕۆژ وە بەپێچەوانەشەوە، ئەم دیاردەیەش تەنها کاتێك ڕوودەدات کە زەوی گۆیی بێت. ئەگەر زەوی تەخت بوایە ئەوکاتە گۆڕانی لەناکاو ڕویدەدا واتە شەو لەناکاو دەبوو بەڕۆژ و ڕۆژیش لەناکاو دەبوو بەشەو. هەروەها ئەم چەند ئایەتەش ئاماژە بە گۆیی زەوی دەکەن :

﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ...٥﴾ الزمر، واتە : ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی ڕاستی دروست کردووە، بەشێوەیەکی کەوانەیی شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت وبەهەمان شێوە ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت (ئەمە بەڵگەیەکی قورئانە لەسەر گۆیی زەوی).

وشەی عەرەبی (کور) واتا (تێهەڵکێشکردن) یان (لول بوون) هەربەو شێوازەی کە جەمەدانی لەسەر دەپێچرێ. تێکهەڵکێشکردن یاخود لولکردنی شەو و ڕۆژ تەنها کاتێك ڕوودەدات کە زەوی گۆیی بێت. زەوی دەقاودەق وەك تۆپ خڕ نیە! بەڵکو گۆییەکی جوگرافییانەیە، مەبەستم لەوەیە کە لە

جەمسەرەکاندا تەخت دەبێتەوە، واتە شێوەی هێلکەیی وەردەگرێت، ئەم ئایەتە باس لە شێوەی زەوی دەکات :

﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾﴾النازعات ،واتە دواتریش زەوی بەشێوەی هێلکەیی بەدیهێناوە.

لە عەرەبیدا بەرامبەر وشەی هێلکە وشەی (دحا)[1] بەکاردێ کە بەواتای هێلکەی وشترمرخ (نەعامە) دێت، شێوەی هێلکەیی وشترمرخ وەکو شێوە گۆییەکەی زەوی وایە. قورئان زۆربەجوانی و بەوردی باسی شێوەی زەوی دەکات هەرچەندە کە قورئان دابەزی بیرۆکەی باو ئەوەبوو کە زەوی تەختە.

رووناکی مانگ ڕوناکییەکی شکاوەیە:

لە شارستانییەتە کۆنەکاندا باوەڕ وابووە کە تیشکی ڕوناکی مانگ هی خۆیەتی، کەچی زانست ئێستا پێمان دەڵێت کە تیشکی ڕوناکی مانگ تیشکێکی شکاوە و پەرچدراوەیە. هەرچەندە ئەم ڕاستییە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە لەم ئایەتەدا :

---

[1] وشەی (دحا) لەلایەن یوسف علی ەوە بە (پانتاییەکی مەزن) مانای کراوە کە ئەوەش هەر ڕاستە بەڵام ئەم وشەیە مانای هێلکەی وشترمرخیش دەگەیەنێت.

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ ﴾الفرقان،

واتە : زۆر گەورە و مەزنە ئەو زاتەی کە لەئاسماندا چەندەها خولگەی گەورەی بەدیهێناوە (بۆ هەسارەکان و ئەستێرەکان)وە چرایەکی پرشنگدار کە خۆرە و مانگێکی ڕوناکیدەری تێدا داناوە.

لە قورئاندا وشەی (الشمس) بۆ خۆر بەکارهاتووە هەروەها وشەی (سراج)یشی بەکارهێناوە کە مانای (مەشخەڵ) دەگەیەنێت. یان وشەی (وهاج) کە واتا چرایەکی .... یان (ضیاء) واتە ڕوناکییەکی پرشنگدار. هەرسێ دەستەواژەکە گونجاون بۆ وەسفکردنی خۆر چونکە خۆر ڕوناکییەکی بەهێو و گەرمییەکی بەتین بەرهەمدێنێت بەهۆی سوتانی ناوەکییەوە. وشەی (قمر) لە قورئاندا بۆ مانگ بەکارهاتووە هەروەها وشەی (منیر) دراوەتە پاڵی کە بەمانای تەنێك دێت کەڕوناکی ببەخشێت، هەڵبەتە مەبەست لێی ڕوناکی شکانەوە و پەرچدانەوەیە.

دووباره وەسفی قورئانی پیرۆز زۆر گونجاوە لەگەڵ سروشتی مانگدا، چونکە ڕوناکی مانگ لە ڕاستیدا هی خۆی نیەو مانگ تەنێکی ناچالاکە و تەنها ئەو ڕوناکییە پەرچ دەکاتەوە و دەیشکێنێتەوە کە لە خۆرەوە وەریگرتووە.

بۆ تەنها جارێکیش لەقورئاندا وشەی (سراج) یان (وهاج) یان (ضياء) بۆ مانگ بەکارنەهێنراوە! نەخۆریشی بە (نور) یان (منیر) وەسف نەکردووە! ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت کە قورئان جیاوازییەکی بەرچاوی کردووە لەنێوان ڕوناکی خۆر و ڕوناکی مانگ. ئەم چەند ئایەتانە باسی سروشتی ڕوناکی خۆر و ڕوناکی مانگ دەکەن :

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا ... ﴿٥﴾ ﴾يونس .

واتە : خوا ئەو زاتەیە کە خۆری کردووە بە سەرچاوەی تیشك و ڕوناکی پرشنگدار، مانگیشی کردووە بە نور.

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ ﴾نوح،واتە : ئایا سەرنجتان نەداوە کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی دروسکردووە؟! مانگیشی لەو نێوانەدا کردووە بەنور و خۆریشی وەك چرایەك داگیرساندووە؟!

کەواتــە قورئــانی پــیرۆز و زانســتی ســەردەم گونجــاون و ڕێککەوتنێکی زۆرنایاب لە نێوانیاندا هەیە دەربارەی سروشتی ڕوناکی مانگ و خۆر.

خۆر دەسوڕێتەوە:

بۆماوەیـەکی زۆر فەیلەسـوفە ئەوروپییـەکان و زانایـان باوەڕیـان وابوو کە زەوی لە ناوەڕاستی گەردووندایە و هەموو تەنەکانی تر بە خۆریشەوە بە دەوری زەویدا دەسوڕێنەوە!

لـە سـەدەی دووهـەمی پـێش زاییـنی لـە سـەردەمی پەتلیمۆسـەوە ئـەم بیرۆکەیــە بــاوبووە، هــەتا لــە ســاڵی ١٥١٢ NicholasCopernicus بیردۆزێکــی پێشــکەش کــرد دەربــارەی جوڵــەی هەســارەکان، جەختی لەسەر ئەوەکردەوە کە خۆر ناجوڵێتەوە و لەناوەڕاستی کۆمەڵگــەی خۆریــدا جێگــرە و هەســارەکانی تــر بەدەوریــدا دەخولێنەوە!

لەسـاڵی ١٩٦٩ زانایـەکی ئـەڵمانی بـەناوی Yohannus Keppler پـەرتوکێکی بـەناوی 'Astronomia Nova' بڵـاوکردەوە. کەتێیـدا گەیشــتبووە ئــەو دەرئەنجامــەی هەســارەکان نــەک تــەنها لــە

خولگەیەکی هێلکەییدا بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە بەڵکو بەخێرایی ناڕێک بەدەوری تەوەرەی خۆشیاندا دەخولێنەوە. بەهۆی ئەم زانیارییانەوە ئاسانکاری دروستبوو بۆ زانا ئەوروپییەکان تا زۆربەی میکانیزمەکانی کۆمەڵەی خۆر بە شێوەیەکی دروس لێکبدەنەوە. بۆنمونە بەدوایەکداهاتنی شەو و ڕۆژ.

پاش ئەم دۆزینەوەیە زانایان باوەڕیان وابوو کە خۆر جێگر و چەسپاوە و وەکو زەوی بەدەوری تەوەرەکەی خۆیدا ناسوڕێتەوە، بیرم دێت کە لەقوتابخانەدا ئەم هەڵە زانستییەم دەخوێند. سەرنجی ئەم ئایەتەی قورئان بدە :﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾الأنبياء، واتە : هەر ئەو زاتەیە کە شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگی بەدیهێناوە، هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێتەوە و مەلە دەکات.

وشەی (یسبحون) لەم ئایەتەی سەرەوە بەکارهاتووە کە لە وشەی (سبح)ەوە هاتووە کە مانای جوڵەی تەنەکان لەخۆدەگرێت. ئەگەر ئەم وشەیە بۆ کەسێك لەسەر زەوی بەکارهات ئەوە

بەمانای لولبون و مەلەکردن نایات بەڵکو بەمانای ڕۆیشتن یان ڕاکردن دێت. بەڵام ئەگەر بۆ کەسێك بەکارهات لەناو ئاودا ئەوە مانای مەلەکردن دەگەیەنێت نەك مانای سەرئاوکەوتن. بەهەمان شێوە وشەی (یسبح) ئەگەر بۆتەنێکی بۆشایی وەك خۆر بەکارهات ئەوە تەنها بەمانای گەشتکردن بەکارنایەت و بەس! بەڵکو واتا خولانەوەی شتەکە لەکاتی جوڵەدا (کە وەك مەلەکردنی لێدێتەوە)[1].

بۆ سەلماندنی سوڕانەوەی خۆر بەدەوری تەوەرەی خۆیدا پێویستمان بە ئامێرێکە کە وێنەی خۆرمان بۆ بخاتە سەر مێزێك یان تەختەیەك، بەم شێوەیە دەتوانین سەیری خۆربکەین بێ ئەوەی چاومان بنوقێنین و ئازاری چاومان بدات. تێبینیکراوە کە هەموو ٢٥ ڕۆژ جارێك خۆر جوڵەیەکی بازنەی دەکات واتە خۆر پێویستی بە ٢٥ ڕۆژە بۆ خولانەوە بەدەوری خولگەکەی. خۆر بە خێرایی نزیکەی ٢٤٠کم لە چرکەیەکدا لە بۆشایی ئاسمان گەشت دەکات. نزیکەی ٢٠٠,٠٠٠٠٠٠ دووسەد ملیۆن ساڵی

[1] وەرگێڕ.

دەوێت تاكو سورێك بەدەوری چەقی (ڕێگای شیری گەلە ئەستێرە)[1] كەی خۆماندا دەسوڕێتەوە.

﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾يس، واتە : نەخۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات و نە شەویش پێش ڕۆژ دەكەوێت، هەریەكەیان لە خولگەیەكی(تایبەتی خۆیدا)مەلە دەكات(بەپێی یاسا).

ئەم ئایەتە باسی لە ڕاستییەكی زانستی و بنچینەیی گرنگ كردووە كە ئا لەم سەردەمانەی دواییدا دۆزرایەوە ئەویش ئەوەیە كە هەریەك لە خۆر و مانگ خولگەی تایبەتیی خۆیان هەیە و هەریەكەیان گەشت و جوڵەی تایبەتی خۆیان هەیە لە گەردووندا! خۆر بەرەو "شوێنە جێگرەكەی" گەشت دەكات و كۆمەڵەی خۆریش لەگەڵ خۆی دەبات، ئەم شوێنە جێگرە لەلایەن زانایانی ئەستێرەناسییەوە زۆر بەوردی دیاریكراوە و ناوی

[1] گەلە ئەستێرەیەكی گەورەیە كە كۆمەڵەی خۆری خۆمان بەشێكی بچوكە تێیدا! نزیكەی ٢٠٠ بلیۆن ئەستێرە لەخۆی دەگرێت تیرەكەی ١٠٠,٠٠٠ ساڵی ڕوناكییە! و ئەستورییەكەی ١٠٠٠ ساڵی ڕوناكییە! ((وەرگێڕ))

لێنراوە (لوتکەی کۆمەڵەی خۆر) کە دەکەوێتە گەلە ئەستێرەی (هەرقل)ەوە کە ئێستا شوێنەکەی بە ورد و درشتی زانراوە!

کاتێك مانگ بەدەوری تەوەرەی خۆیدا دەخولێتەوە هەمان کات دەخایەنێت وەك ئەوەی بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە کە نزیکەی ٢٩.٥ بیست و نۆ ڕۆژ و نیو دەخایەنێت بۆ تەواوکردنی خولێکی تەواو.

ئای چەندە سەرسوڕهێنەرە ئەم ڕاستییە زانستییانەی کە لە ئایەتەکانی قورئاندا باسکران! ئەرێ بۆچی پرسیارێك نەوروژێنین؟ ئەبێت سەرچاوەی ئەم هەموو زانیارییانە چیبێت کە لە قوڕئاندا هاتوون؟!

ڕۆژێك دێت کە خۆر دەکوژێتەوە:

ڕوناکی خۆر بەهۆی کۆمەڵێك کارلێکی کیمیاییەوە ڕوودەدات کە بەبەردەوامی بۆ ماوەی ٢٠ ملیۆن ساڵە ڕوودەدات، ئەوەش ڕۆژێك دێت کە کۆتایی پێدێت و دەکوژێتەوە کە بەهۆیەوە ژیان لەسەر زەویش کۆتایی پێدێت! دەربارەی تاهەتایی نەمانەوە و کۆتاییپێهاتنی خۆر قوڕئان دەفەرموێ :

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٣٨ ﴾[1] یس

واتە : خۆریش بەردەوام دەبێت لە کارەکانی تا ئەوکاتەی بۆی دیاریکراوە کۆتایی دێت، بێگومان ئەمە توانای زاتێکیباڵادەست و زانا دەردەخات.

لەم ئایەتەدا وشەی (مستقر) بەکارهاتووە کە مەبەست لێی شوێنێك یان کاتێکی دیاری کراو و پلان بۆ داڕێژراوە. کەواتە لەقورئاندا هاتووە کە خۆر بەرەو خاڵێکی دیاریکراو دەڕوات و کە بێگومان لەکاتێکی دیاریکراودا ڕوودەدات کە پێشتر بۆی دیاریکراوە. واتە : کۆتایی پێدێت و دەکوژێتەوە!

ماددەیەك لەنێوان ئەستێرەکاندا:

پێشتر وادەزانرا کە بۆشایی گەردوون هیچی تیانییە و بۆشاییەکی بەتاڵە، زانایانی فیزیای ئەستێرەناسی لەم دواییانەدا ماددەیەکیان دۆزییەوە لەنێوان ئەستێرەکاندا کە ناونرا (پلازما) کە پێکدێت لە گازی ئایۆنی کە ژمارەیەکی

---

[1] هەمان پەیام لەچەند ئایەتێکی تری قورئانی پیرۆز دوبارە بۆتەوە : ٢:١٣، ٣٥:١٣، ٣٩:٥، ٣٩:٢١.

یەکسان لە ئەلیکترۆنی بارگە سالب و پرۆتۆنی بارگە موجەب لەخۆدەگرێت. هەندێك جار پلازما بەدۆخی چوارەمی ماددە لە قەڵەم دەدرێت دوای سێ دۆخەکەی تری ماددە کە بریتین لە ڕەق و شل و گاز. قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا ئاماژە بەم ماددەیەی نێوان ئەستێرەکان دەکات :

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا... ﴿٥٩﴾ ﴾الفرقان .

واتە : ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەونێوانەدا هەیە دروست کردووە.

فراوانبوونی گەردوون:

لەساڵی ١٩٢٥ زانای ئەستێرەناسی ئەمریکی Edwin Hubble چەند بەڵگەیەکی تێبینیکراوی پێشکەشکرد کە باس لە لێکدورکەوتنەوەی گەلە ئەستێرەکان دەکات لە یەکتری کە ئەوە دسەلمێنێ گەردوون لە فراوانبووندایە. لە ئێستاشدا فراوانبوونی گەردوون ڕاستییەکی چەسپاو و سەلمێنروە. قورئانی پیرۆزیش بەم شێوەیە باسی ئەم دیاردەیەمان بۆدەکات:

﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الــذاريات، واتـــە : ئێمـــە ئاسمانمـــان بـــە هێـــز و دەســـەڵاتی خۆمـــان دروســـتکرد و بەردەوامیش گەورە و فراوانی دەکەین.

وشەی (موسعون) بەتەواوی بەمانای فراوانکردن دێت کە بۆ بەدیهێنان و بەرفراوانکردنی گەردوون دەگەڕێتەوە. یەکێك لە زانا هەرە گەورەکانی بواری فیزیای ئەستێرەناسی Stephen Hawking لەپەرتوکی(A brief history of time)دا دەڵێت :

(( دیاردەی فراوانبوونی گەردوون گەورەترین دۆزینەوەی زانستی و شۆڕشێکی زانستیی مەزنی سەدەی بیستەم بوو)).

کەچی قورئان پێش ئەوەی مرۆڤ تەلیسکۆپ دروست بکات فراوانبوونی گەردوونی باسکردووە.

لەوانەیە هەندێك کەس بڵێن بوونی چەند ڕاستییەك دەربارەی گەردوون لە قورئاندا سەرسوڕهێنەر نیە چونکە عەرەب لەو بوارەدا پێشکەوتووبوون! ڕاستیش دەکەن کە عەرەب لەو بوارەدا پێشکەوتووبوون بەڵام ئەوان نازانن کە قورئان پێش شارەزابوونی عەرەب لە بواری ئەستێرەناسی دابەزیوە! بەڵام

زۆرێك لە ڕاستییە زانستییەکانی قورئان وەك تەقینەوە گەورەکە لە سەرەتای دروستبوونی گەردوون و ......هتد تەنانەت لە لوتکەی پێشکەوتنی عەرەبیشدا نەزانرابوون! بۆیە ئەم ڕاستییە زانستییانەی کە لە قورئاندا باسکراون بەهۆی پێشکەوتنی عەرەب نەبووە لە بواری ئەستێرەناسی بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە، واتە پێشکەوتنی عەرەب لەبواری ئەستێرەناسیدا بەهۆی بوونی جێگایەکی تایبەت بووە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ زانستی ئەستێرەناسی.

**٢. فیزیا...**

## ئەتۆمیش لە چەند بەشێک پێک هاتووە

**لە کۆندا بیردۆزێکی بەناوبانگ هەبوو کە لای خەڵکی زۆر پەسند بوو، ناوی (بیردۆزی ئەتۆمی) بوو (Theory of atomism) ،یەکەمجار ئەم بیردۆزە لەلایەن زانای بەناوبانگی یۆنانی Democritus ەوە پێشنیارکرا، کە ٢٣ سەدە پێش ئێستا ژیاوە، Democritus و ئەوانەی دوای ئەویش ژیاون بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بچوکترین یەکەی پێوانەی ماددە بریتییە لە ئەتۆم Atom هەروەها عەرەبی سەردەمی کۆنیش هەمان بیروبۆچونیان هەبوو. لەزمانی عەرەبیدا وشەی (الذرة) بەرامبەر وشەی ئەتۆم بەکاردێت. زانستی سەردەم ئەوەمان پێدەڵێت کە دەکرێ ئەتۆمیش دابەشبکرێت بۆ بەشی لەخۆی بچوکتر و ئەم ڕاستییەش بەرهەمی سەدەی بیستە، بەڵام پێشنیارکردنی ئم ڕاستییە ١٤ سەدە لەمەوبەر دەبێتە شتێکی نامۆ تەنانەت بۆ خودی عەرەبەکانیش! چونکە (ذرة) یان ئەتۆم سنوری کۆتایی**

بووە لە بیری ئەواندا بەڵام کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ئەم سنورەی ڕەت کردەوە :

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٣ ﴾[1] سبا، واتە : ئەوانەی خوانەناس بوون دەیانوت قیامەت نیە و نامانگاتیٚ، ئەی پێغەمبەر پێیان بڵیٚ نەخێر وانیە سوێند بەپەروەردگارم هەر یەختان دەگرێت (چونکە ئەو زاتە) زانایە بە نهێنی و شاراوەکان، تەنانەت بە ئەندازەی ئەتۆمێکیش لەئاسمانەکان و زەویدا ناتوانریٚ لەو پەنهان بکریٚ، هەروەها نە لەوە بچوکتر و نە لەوەش گەورەتر کە لەکتێبی تایبەتیدا ڕونو ئاشکرا نەبێت.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بە زانستی ڕەهای پەروەردگار دەکات کە هیچ شتێك لیٚی ون نابێت و هەموو شتێك دەزانێت چ شاراوەبێت یان ئاشکرا. لەمەش زیاتر خوای گەورە باسی

[1] هەمان ڕاستی لە قورئاندا لە ١٠:٦١ دا باسی لێوەکراوە.

ئەوەدەکات کە ئاگادارە بەهەمووشتێك کە گەورەتر یان بچوکتر بێت لە ئەتۆم بەم شێوەیە دەقەکە بە ڕوونی باسی ئەوەدەکات کە دەکرێ شتێك بچوکتر بێت لە ئەتۆم، ئەم ڕاستییەش تا ئەم ماوانەی پێشوو نەدۆزرابۆوە.

## ٤. زانستی ئاو...

# سوڕی ئاو

لەساڵی ١٥٨٠دا کە Bernard Polissoy بیردۆزی سوڕی ئاو (Water cycle)ی باسکرد، ئەوەی وت کە چۆن ئاو دەبێت بە هەڵم لە زەریاکاندا و دواتر سارد دەبێتەوە و دەبێت بە هەور و هەورەکان لەو ناوچانەدا دەسوڕێنەوە کە تێیدا دروست بوون و دواتر چڕدەبنەوە و باران دەبارێنن. پاشان ئەم ئاوە لەشێوەی جۆگە و دەریاچە کۆدەبێتەوە و دەڕژێتە ناو زەریاکان و ئەم سوڕەش کە باسمان کرد سوڕێکی بەردەوامە. لەسەدەی حەوتەمی پێش زاین، Thales of Miletus[١]، بڕوای وابوو کە (با) پڕیشکە ئاوەکانی سەر ڕووی زەریاکان هەڵدەگرێت و پاشان لەشێوەی باران دەیبارێنێت. لەسەردەمی کۆندا خەڵکی سەرچاوەی ئاوی ژێر زەوییان نەدەزانی، وایاندەزانی کە ئاوی

---

[١] یەکێکە لە زانا و فەیلەسوفە کۆنەکانی یۆنانییەکان کە لە نێوان ساڵانی ٦٢٤-٥٤٤ پێش زاین ژیاوە. بەباوکی زانست و یەکەمین فەیلەسوی یۆنانی لەقەڵەم دەدرێت. ((وەرگێڕ))

زەریاکان بەهۆی کاریگەری (با)وە بە کیشوەرەکاندا دێت و دەچێت و دەگوازرێتەوە، هەروەها بڕوایان وابوو کە ئاوەکان لەڕێگەی چەند ڕێڕەوێکی نهێنی یان چاڵی گەورەوە دەگەڕێنەوە نێو زەریاکان، ئەم ڕێڕەوانەش پێیان دەوترا 'دۆزەخ'، ئەم بیرۆکانە تا سەردەمی ئەفلاتون (Plato) بەردەوامبوو، تەنانەت دیکارت (Descartes) کەیەکێك بوو لە گەورەترین بیرمەندەکانی سەدەی هەژدەهەم ئەم بیرۆکانەی پشتڕاستکردەوە، تا سەدەی نۆزدەهەم لەبیردۆزەکەی ئەرستۆ (Aristotle) شتێکی باوبوو، کە بەگوێرەی ئەم بیردۆزە ئاو لە ئەشکەوتە ساردەکاندا چڕدەبێتەوە پاشان جۆگە و دەریاچەکان دروست دەکات کە دەچنە نێو کانیەکانەوە. بەڵام لە سەردەمی ئێستادا ئێمە گەیشتووین بەو ڕاستییەی کە ڕێژنە بارانەکان کە دەڕژێنە نێو درزەکانی زەوییەوە بەرپرسن لە بوونی ئاوی ژێر زەوی.

ئەمەش لەم دەقەدا لە قورئاندا باسکراوە :

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ...﴿٢١﴾ ﴾ الزمر، واتە : ئایا سەرنجت نەداوە کە

بەڕاستی خوای گەورە لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە و لەوەودوا لەناخی زەویدا کۆیکردووەتەوە، پاشان بەشێوەی کارێز و کانی دەریدەهێنێت، ئیمجا هەر بەو ئاوە کشتوکاڵی هەمەجۆر و هەمەڕەنگبەرهەمدەهێنێت.

﴿ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الروم، واتە : وە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت کە زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای ئەوەی کە مردبوو (وشکبوونی ڕووەك وگژوگیا) بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە ژیرییان بخەنەکار.

﴿ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾

المؤمنون ،واتە : هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بە ئەندازە و نەخشەیەکی دیاریکراوەوە بارانمان باراندووە و ئینجا لەناخی زەوی جێگیرمانکردووە، بێگومان ئێمە بە جۆرەها شێوە دەتوانین ئەو ئاوانە لەناوبەین و ئەو سەرچاوانە وشك بکەین.

هیچ دەقێك نیە كە مێژووەكەی بگەڕێتەوە بۆ ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر و بەم شێوەیە وردە وەسفی سوڕی ئاوی كردبێت.

دیاردەی بەهەڵمبوون:

﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ ﴿١١﴾ ﴾الطارق،واتە : سوێند بە ئاسمان كە خاوەنی گێڕانەوەیە.

با هەورەكان دەپیتێنێت:

﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ ... ﴿٢٢﴾ ﴾الحجر .

واتە : (یەكێك لە نیشانەكانی خوا ئەوەیە) ئێمە شنەبامان ناردووە كە پیتێنەری ڕووەك و دار و درەختە هەروەها بارانمانلە ئاسمانەوە باراندووە و ئێوەی پێ تێرئاو دەكەین.

وشەی (لواقح) لێرەدا بەكارهێنراوە بریتییە لە كۆی وشەی (لقح) كە واتا پیتاندن یاخود سكپڕكردن، لەم دەقەدا وشەی (پیتاندن) ئەوەدەگەیەنێت كە با هەورەكان پاڵدەنێ بۆلای یەكتری و بەم شێوەیە چڕییەكەیان زیاد دەكات و دەبێتە هۆی دروستبوونی هەورەبروسكە، وە پاشان باران بارین.

هەمان باس لەم دەقانەی تری قوڕئاندا بەدیدەكرێت :

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَنْ مَنْ يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ ﴿٤٣﴾ ﴾ النور ،واتە : ئایا نابینن کە بێگومان خوا هەورەکان بە ئارامی و بەشێنەیی بە ئاسماندا دەبات، دوایی پەیوەستیان دەکاتبەیەکەوە، ئەوسا کەڵەکەیان دەکات لەسەریەك، ئینجا دەبینن لە توێی ئەو هەورانەوە کە وەکو کێو وان باران و تەرزەدەبارێنێن، جا لە سودی ئەو بارانە هەرکەس خوا بیەوێت خێر و بەرەکەتی پێدەبەخشێت، هەرکەسیش کە بیەوێت لێیدووردەخاتەوە، (هەورەبروسکەکان ئەوەندە بەهێزن) خەریکە بریسکەکەیان بینایی چاوان بەرێت.

﴿ اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾الروم ، واتە : خوا ئەو زاتەیە کە چەندەها جۆر -با- دەنێرێت ئەو(با)یە هەور هەڵدەگرێت و لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی دەکات، جا خواپەخشی دەکاتەوە بە ئاسماندا بە هەرشێوازێك

**کە بیەوێت، هەورەکان پارچەپارچە دەکات، ئینجا دەبینیت کە چۆن بارانلە نێوانیانـدا دەردەچـێت و دەبارێتـە سـەر زەوی، جاکاتێک کە بارانەکەی باراند بۆ هەرتاقمێك لە بەندەکانی کە بیەوێتسودمەندیان دەکات، ئەوانیش یەکسەر خۆشحاڵ دەبن و مژدەدەدەن بەیەکتری.**

**بێگومان داتا نوێکانی زانستی ئاوزانیش زۆر باش یەکدەگرنەوە لەگەڵ وەسفە قورئانییەکان بۆ هەمان دیاردە، سوڕی ئاو لە چەندەها ئایەتی تری قورئانی پیرۆزدا باسکراوە : ٧:٥٧, ١٣:١٧, ٢٥:٤٨-٤٩, ٣٥:٩, ٣٦:٣٤, ٤٥:٥, ٥٠:٩-١١,٥٦:٦٨-٧٠ وە٦٧:٣٠ .**

## ٥. زەویزانی...

## شاخەکان وەک مێخی چادر وان

لـە زانسـتی زەویزانیـدا دیـاردەی (لولبـوون) دیاردەیـەکی تـازە دۆزراوەیە. دیاردەی لولبوون بەرپرسە لە دروستبوونی زنجیرە چیاکان، ئـەم توێکڵـەی زەوی کـە ئێمـە لەسـەری دەژیـن وەك قاوغێکی ڕەق وایە، بەڵام چینەکانی تری ژێرەوە گەرم و شلن، هەربۆیە شیاو نیە بۆ هیچ جۆرێکی ژیان. ئەوەش زانراوە کە جـێگیری و چەسـپاوی شـاخەکان پەیوەسـتە بـە دیـاردەی لولبوونـەوە، کـە هـەر ئـەم لولبوونانـەش بوونـە هـۆی بنچـینە و دامەزرێنەری شاخەکان.

زانایـانی بـواری زەویزانـی پێمـان دەڵـێن کـە نیـوەتیرەی زەوی ٦٠٣٥ کیلۆمەترە و ئەو توێکڵەی زەوی کە ئێمە لەسەری دەژین زۆر تەنکە و لەنێوان ٢کم بۆ ٣٥کم دایە. بەهۆی تـەنکی توێکڵی زەوییەوە ئەگەری توشبوون بە بومەلەرزە و لەرزینەوە زۆرە.
شاخ و کێوەکان هەروەکو کۆڵەکە یان مێخـی چادر کاردەکەن کە چینی توێکڵی زەوی دەگرن و ناهێڵن توشـی لـەرزین و شلۆقان

بێت و جێگری و چەسپاوی بەم توێکڵە تەنکە دەبەخشن، قورئانی پیرۆزیش دەقاودەق هەمان وەسفی بۆ ئەم دیاردەیە تێدایە :﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ۝٦ وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ۝٧﴾النبا

واتە : ئایا زەویمان وەك لانكە بۆ فەراهەم نەهێناوە؟ ئایا كێوەكانمان وەك مێخ بۆ دانەكوتاوە؟

وشەی (اوتاد) واتە كۆڵەكە یان مێخ (ئەوەی چادر و ڕەشماڵی پێ جێگیر دەكرێت)، كە تەنی قوڵی لولن لە زەویدا چەسپاون.

پەرتووكی 'Earth' كە لە زۆربەی زانكۆكانی جیهاندا دەخوێنرێت، یەكێك لە نوسەرەكانی دكتۆر (Frank Press) ە كە بۆماوەی دوازدە ساڵ سەرۆكی بەشی ئەكادیمی زانست بوو لە ئەمریكاهەروەها ڕاوێژكاری زانستی سەرۆك كۆماری پێشووی ئەمریكا (Jimmy Carter) بوو، لەپەرتووكەكەیدا زۆر بەجوانی ڕوونی كردۆتەوە كە شاخەكان وەك مێخ وان و زۆر بەقوڵی ڕەگەكانیان بەزەویدا داچەقیوە[١]، بەگوێرەی وتەكانی ئەم

---

[١] Earth, Press and Siever, p. ٤٣٥. Also see Earth Science, Tarbuck and Lutgens, p. ١٥٧

**دکتۆرە، چیاکان ڕۆڵێکی گەورە دەبینن لە چەسپاندن و جێگیرکردنی توێکڵی زەویدا. قورئانی پیرۆز زۆر بە ڕوونی ئاماژەی بە فرمانی شاخ و کێوەکان داوە لە پاراستنی زەوی لە بومەلەرزە و شلۆقان**

**﴿ وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ ... ﴿٣١﴾ ﴾الأنبياء**

**واتە : وە لە زەویدا کەژ و کێوەکانمان چەسپاندووە تا لاسەنگ نەبێت و لارنەبێتەوە و هەڵیان نەگێڕێتەوە.**

**لەچەند ئایەتێکی تریشدا باسی هەمان پەیام کراوە : لە ٣١:١٠ وە ١٦:١٥ .**

**بەڕاستی هاورمانایی و ڕێککەوتنێکی زۆر ناوازە بەدیدەکرێت لەنێوان وەسفە قورئانییەکان و داناکانی بواری زەویزانی.**

**کێوەکان بە تۆکمەیی جێگیرکراون:**

**ڕووکاری زەوی بۆ چەندەها پارچەی ڕەق کەرت کراوە کە نزیکەی ١٠٠ کم ئەستور دەبێت. ئەم پارچانە سەر شوێنی نیمچە تواوە( کە پێیان دەوترێ asthenosphere) دەکەون. دروستبوونی شاخەکان لە لێوارەکانی ئەم پارچانەدا ڕوودەدات.**

چینی توێکڵی زەوی بە ئەستوری ٥کم لە بنی زەریاکانەوەیە و نزیکەی ٣٥ کم لە ژێر ڕووتەختی کیشوەرەکانەوەیە و نزیکەی ٨٠کم ئەستورییەکەیەتی لەژێر زنجیرە چیا گەورەکانەوە. ئەمانەش دامەزرێنەری بەهێزن کە چیاکانیان لەسەر دانراوە. قورئانی پیرۆزیش لەم ئایەتەدا باسی ئەم دامەزرێنەرە بەهێزەی چیاکان دەکات :﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾﴾النازعات،واتە : کێوەکانیشی بە تۆکمەیی دامەزراندووە.

هەمان پەیام لە قورئاندا ٨٨:١٩ دا دووبارەکراوەتەوە.

بەم شێوەیە ئەم زانیارییانەی کە لەقورئانی پیرۆزدا باسکراون دەربارەی سروشتی چیا و کێوەکان زۆر بەوردی دەگونجێت لەگەڵ دۆزینەوە شازەکانی زانستی زەویزانیدا.

## ٦. زەریاناسی...

## بەربەستێک لەنێوان ئاوی شیرین و ئاوی سوێردا

﴿ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ ﴾الرحمن،واتە : ئاوی دو دەریای بەرەڵاکردووە و بەیەکی گەیاندوون و تێکەڵیش نابن چونکە لەنێوانیاندا بەربەستێك هەیە نامێڵێتتێکەڵبن.

ئەم دیاردەیە لەنێوان دەریای سپی و زەریای ئەتڵەسی و دەریای سور و دەریای عەرەبیدا ئاشکرایە. لە دەقە قورئانییەکەدا وشەی (برزخ) بەکارهاتووە کە بەمانای بەربەست یاخود جیاکەرەوە دێت، ئەم بەربەستە هەرچەندە بەربەست و جیاکەرەوەیەکی فیزیایی نیە بەڵام وشەی (مرج) لەڕووی ئەدەبییەوە بە مانای پێکگەیشتن و تێکەڵبوون دێت لەگەڵ یەکدیدا. ڕاڤەکارانی قورئان سەرەتا نەیاندەتوانی ئەم دوو دیاردە پێچەوانەیە لێکبدەنەوە، مەبەستم ئەوەیە کە لەکاتێکدا دەڵێت بەیەك دەگەن و تێکەڵ نابن لەهەمان کاتیشدا دەڵێت بەربەستێك لەنێوانیاندا هەیە! زانستی سەردەم دەریخستووە کە ئەگەر لە شوێنێك دوو

دەریای جیاواز بەیەك بگەن ئەوە بەربەستێك دروست دەبێت لەنێوانیاندا. ئەم بەربەستە هەردوو دەریاکە لێك جیادەکاتەوە بەشێوەیەك کە هەردوو دەریاکە پلەی گەرمی و ڕێژەی سوێری و چڕی تایبەت بەخۆیان دەبێت[١]. ئێستا زانایانی بواری زەریاناسی زۆر بەباشی دەتوانن ڕاستێتی ئەم ئایەتە ڕوون بکەنەوە، بەربەستێکی لاری نەبینراو لەنێوان ئاوی هەردوو دەریاکەدا هەیە کە لەڕێگەیەوە ئاوی لایەکیان دەتوانێت بچێتە لاکەی ترەوە. بەڵام کاتێك ئاوی دەریایەکیان دەچێتە دەریاکەی ترەوە ئەوە ئەوکاتە سیفەتە تایبەتییەکانی خۆی لەدەست دەدات و وەك ئەو ئاوەی لێدێت کە چووەتە ناویەوە.

بەم شێوەیە ئەم بەربەستە وەکو (گوێزەرەوەیەکی هاوچەشنکەر (transitional homogenizingarea) بۆ هەردوو ئاوەکە کاردەکات، ئەم دیاردەیە هەروەها لەم ئایەتەشدا باس کراوە :

﴿وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ...﴾ (٦١) النمل،واتە : وە لەنێوان دوو ئاوەکەشدا بەربەستی جیاکەرەوەی بەرپاکردووە.

---

[١] Principles of oceanography, Davis, pp. ٩٢-٩٣

ئەم دیاردەیە لە چەند ناوچەیەکدا ڕوودەدات لەوانە لەنێوان دەریای سپی ناوەڕاست و زەریای ئەتڵەسی لە کێوی تارق دا.

هەروەها بەربەستێکی سپی هەیە لە باشوری ئەفریقا لە شوێنێکدا کە زەریای ئەتڵەسی و زەریای هێمن بەیەك دەگەن بەڵام کاتێك قورئان باسی بەربەستەکە دەکات لەنێوان ئاوی شیرین و ئاوی سوێردا لەگەڵ باسکردنی بەربەستدا باسی بوونی (کۆسپێکی جوداکەرەوە) دەکات :

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾﴾الفرقان،واتە : هەر ئەوزاتەی کە ئاوی دوو دەریا یان دوو ڕووبار لەپاڵیەکدا وەك خۆیان دەهێڵێتەوە و( تێکەڵ نابن چونکە چڕییانجیاوازە) کە یەکێکیان شیرین و سازگارە و ئەوی تریان تفت و سوێر، وە بەربەستێکی لەنێوانیاندا دروست کردووە لەگەڵکۆسپێکدا کە ناهێڵێت تێکەڵبن.

زانستی سەردەم بۆی دەرکەوتووە کە لەڕێژگەی ڕووبارەکاندا، کاتێك ئاوی شیرین و سازگار دەگات بەئاوی سوێر حاڵەتەکە زۆرجیاوازترە لەوەی کە ئاوی سوێری دوو دەریا بەیەك بگەن.

بۆیـان دەرکـەوت کـە ئـەوەی ئـاوی شـیرین لـەئاوی سـازگار جیادەکاتـەوە لـە ڕێژگـەی ڕووبارەکانـدا بریتییـە لـە ناوچەیەکی چڕی جیاواز کە بەردەوام چڕییەکەی دەگۆڕێت و دوو بەشەکە لەیەك جیادەکاتەوە[1]، ئەم ناوچەیە جیاکەرەوەیەش سوێرییەکی هەیـە کـە جیـاوازە لـە سـوێری هـەردوو ئـاوە سـازگار و ئـاوە سوێرەکە[2].

ئـەم دیاردەیـە لـە زۆرشـوێندا ڕوودەدات لەوانـە میسـر کاتێـك ڕووبـاری نیـل دەڕژێتـە دەریـای سپی ناوەڕاسـت، ئـەم دیـاردە زانسـتییەی کـە لـە قوڕئـانی پـیرۆزدا ئامـاژەی پێکـراوە لەلایـەن دکتۆر (William Hay) کە زانای بەناوبانگی بواری دەریاوانییـە و پڕۆفیسـۆرە لـە زانسـتی زەویناسـی لـە زانکـۆی کۆلـۆرادۆ لـە ئەمریکا پشتگیریلێدەکرێت و پشتڕاستکراوەتەوە.

---

[1] Oceanography, Gross, p.٢٤٢. Also see introductory Oceanography, Thurman, pp. ٣٠٠-٣٠١.

[2] Oceanography, Gross, p. ٢٤٤ and Introductory Oceanography, Thurman, pp. ٣٠٠-٣٠١.

**تاریکایی لە قوڵایی زەریاکاندا:**

**پرۆفیسۆر (Durga Rao) کە لە جیهاندا بەناوبانگە و پرۆفیسۆرە لەبواری دەریاوانی و زەویناسیدا لە زانکۆی (مەلیك عبدالعزیز) لە (جدة) پرۆفیسۆر بووە، داوای لێکرا کە تێبینی خۆی بڵێ دەربارەی ئەم ئایەتە پیرۆزە :**

**﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾النور، واتە : یاخود (کردەوەیان) وەك چەندەها تاریکایی وایە لەناو دەریایەکی قوڵ شەپۆل لەسەر شەپۆل بدات بەسەریدا،لەسەروشییەوە هەورێکی تاریك دایگرتبێت، تاریکاییەکان چین چین لەسەریەك نیشتبن، کاتێك کە دەستی دەربهێنێتخەریکە دەستی خۆی نەبینێت (لەبەر تاریکی)، بێگومان هەرکەسێك خوا نوری پێنەبەخشێت، هەرگیز نوری دەستناکەوێت.**

**پرۆفیسۆر Raoئەوەی وت کە زانایان تەنها دەتوانن جەخت بکەنەوە لەسەر بوونی تاریکایی لە قولایی زەریاکاندا، هەڵبەتە**

ئەمەش بە یارمەتی ئامێری پێشکەوتوو و سەردەمییانەیە، هەرگیز مرۆڤ بەبێ یارمەتی ئامێر و یارمەتیدەرێك ناتوانێ بچێتە قولایی زیاتر لە ٢٠ بۆ ٣٠ مەتر لە زەریاکاندا و بەزیندویی بمێنێتەوە، ئەم ئایەتەش مەبەستی لە هەموو دەریاکان نیە، چونکە هەموو دەریایەك ناتوانرێ بەوە وەسف بکرێت کە چەند چینێکی تاریکی لەسەریەکی تێدایە، ئەم ئایەتە زیاتر مەبەستی دەریا و زەریا قوڵەکانە چونکە دەفەرموێت (تاریکایی لە زەریا قوڵەکاندا). ئەم چینە تاریکاییە لە زەریا قوڵەکاندا بەهۆی دوو هرکارەوە دروست دەبێت :

١. تیشکی ڕووناکی لە حەوت ڕەنگ پێك دێت کە پەلکە زێڕینە دروست دەکەن، حەوت ڕەنگەکانیش ئەمانەن :(وەنەوشەیی، نیلی، شین، سەوز، زەرد، پرتەقاڵی و سور).

تیشکی ڕوناکی توشی شکانەوە دەبێت کاتێك بەرئاودەکەوێت، نزیکەی ١٠ تا ١٥ مەتری بەشی سەرەوەی ئاوەکە ڕوناکی سور هەڵدەمژێت. بۆیە کاتێك مەلەوانێك بچێتە قولایی ٢٥ مەتر و برینداربێت ئەوە ناتوانێت ڕەنگی سوری خوێنەکەی خۆی

ببینێت، چونکە ڕەنگی سور ناگاتە ئەم قوڵاییە.بەهەمان شێوە، ڕەنگی پرتەقاڵی لەنێوان ٣٠ تا ٥٠ مەتردا هەڵدەمژرێت، زەرد لە ٥٠ بۆ ١٠٠ مەتردا هەڵدەمژرێت، سەوز لە ١٠٠ بۆ ٢٠٠ مەتردا، لەکۆتاییدا شینیش لەخوارووی ٢٠٠ مەترەوە هەڵدەمژرێت و وەنەوشەیی و نیلی لە زیاتر لە ٢٠٠ مەتردا هەڵدەمژرێن. بەهۆی هەڵمژینی یەک لەدوای یەکی ڕەنگەکانەوە، یەک لەدوای یەک و چین لەسەر چین هەتا دێت زەریا تاریکتر دەبێت. واتە تاریکایی بەگوێرەی تیشکی ڕوناکییەکان دروست دەبێت و لە خوار ١٠٠ مەترەوە بەتەواوەتی تاریک دەبێت.

٢. تیشکی خۆر لەلایەن هەورەکانەوە هەڵدەمژرێت و دواتر ڕوناکییەکە پەرت و بڵاودەکاتەوە و چینێك لە تاریکایی لەژێر هەورەکاندا دروست دەکات. کە ئەمە یەکەمین چینی تاریکاییە. کاتێك ڕوناکییەکان دەگەنە سەر ڕوکەشی زەریاکان، وە لەلایەن ڕوکەشە شەپۆلدارەکانی زەریاکانەوە دەشکێنەوە کە بریسکەدار دەردەکەوێت. بۆیە ئەوە شەپۆلەکانن کە ڕوناکی دەشکێننەوە و تاریکایی دروست دەکەن. ئەو تیشکە ڕوناکییەی کە

نەشکاونەتەوە بەقوڵایی زەریاکاندا تێپەڕدەبن. بۆیە زەریا لە دوو بەش پێك دێت. بەشی ڕوپۆشی سەرەوە کە پێك دێت لە ڕوناکی و گەرمی و بەشی قوڵایی کە بەتاریکایی جیادەکرێتەوە. هەروەها بەشی ڕوکەش بەهۆی بوونی چەند شەپۆلێکەوە لە بەشی قوڵایی جودا دەکرێتەوە.

شەپۆلە ناوەکییەکان ئاوی قوڵایی دەریا و زەریاکان دادەپۆشن لەبەرئەوەی ئاو لە قوڵاییەکان چڕی زۆرترە وەك لە ئاوی سەرەوە.

تاریکایی لەخوار شەپۆلە ناوەکییەکانەوە دەست پێدەکات. تەنانەت ماسیش لە قوڵایی زەریاکاندا ناتوانێ ببینێت: تاکە سەرچاوەی ڕوناکی لە لاشەی خۆیانەوەیە.

قورئانیش ئەم دیاردەیە زۆربە ڕوونی باس دەکات کاتێك دەفەرموێت :

(تاریکایی لە قوڵایی زەریاکاندا بە چین لەسەر چین شەپۆل داپۆشراوە).

بە واتایەکی تر، لەسەرووی ئەم شەپۆلانەوە چەندەها شەپۆلی تر هەن کە مەبەستم ئەو شەپۆلانەیە کە لەسەر ڕووی زەریاکان بەدیدەکرێت.

ئایەتەکە بەردەوام دەبێت و دەفەرموێت :

(لەسەروشییەوە هەورێکی (تاریك) هەیە، چەندین قولایی تاریك، یەك لەسەر یەك).

ئەم هەورانە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا چەند ڕێگر و بەربەستێکنکە چین چین لەسەر یەك دانراون، کە زیاتر تاریکی دەکەن بەهۆی هەلمژینی ڕەنگەکانەوە لەسەر چەند ئاستێکی جیا جیا.

پرۆفیسۆر (Durga Rao) لە دەرجەنجامدا وتی : (بەڕاستی ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر مرۆڤێکی ئاسایی هەرگیز ناتوانێ باسی دیاردەیەکی لەم جۆرە بەم وردەکارییەوە بکات، بۆیە پێم وایە دەبێت ئەم زانیارییە لەسەرچاوەیەکی سەرووی سروشتەوە هاتبێت)[1].

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾

الفرقان، واتە : هەر ئەو زاتەیە کە لە ئاو(مەنی) مرۆڤ دروست

---

[1] ئەم وشانە لە ڤیدیۆیەك وەرگیراوە بە ناونیشانی (This is the truth) و بۆ دەستکەوتنی ڤیدیۆکە دەتوانی پەیوەندی بکەی بە پێگەی دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی ئیسلامی(IRF.net).

دەكـات، بەهۆیـەوە پەیوەنـدی خزمایـەتی و ژن و ژن خـوازی دروسـتكردووە، بێگومـان بـەردەوام پـەروەردگاری تـۆ دەسـەڵاتی بێسنوری هەیە.

ئایا جێی باوەڕە و دەگونجێ بۆ کەسێك ۱٤ سەدە لەمەوبەر بڵێت ژیـان لـە ئـاوەوە دروسـت بـووە؟ لـەوەش زیـاتر ئایـا بـاوەڕ بـەوە دەكرێت كە ئەمە لە مرۆڤێكی بیابانە عەرەبییەكانەوە هاتبێت كە تیایدا ئاو زۆر دەگمەنە؟

## ٧.ڕووەکزانی...

## ڕووەکەکان ڕەگەزی نێر و مێیان هەیە

لەکۆندا خەڵکی نەیاندەزانی کە ڕووەکاکانیش هەردوو ڕەگەزی نێر و مێیان هەیە. زانستی ڕوەکزانی ئەوەی ئاشکراکردووە کە هەموو ڕووەکێك ڕەگەزی نێر و مێی هەیە. تەنانەت ئەو ڕووەکانەی کە تاك ڕەگەزن، پێکهاتوون لە هەردوو توخمی نێر و مێ.

﴿...وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾﴾طه،

واتە : وە لەئاسمانەوە بارانی دابەزاندووە کە چەندەها جۆر ڕووەکی بە شێوەی جووت پێگەیاندووە و هەریەکەیان لەوی ترجیاوازە.

میوەکان نێر و مێیان هەیە:

﴿... وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ... ﴿٣﴾﴾الرعد ،واتە : هەموو میوەیەکی بەشێوەی جووت، دوو دوو، بەرهەمهێناوە.

میوە بەرهەمی کۆتایی درەختە پلەبەرزەکانە. پێش میوە قۆناغی گوڵ هەیە. کە لە هەردوو توخمی نێەر و مێیەپێکدێت (تۆو و

هێلکـە). کاتێـك پـۆرگ دەگوازرێتـەوە بـۆ گوڵەکـە، ئـەوە میـوە بەرهەمدێت کە دواتر گەشەدەکات و تۆوەکانی بەرەڵادەکات. بەو شـێوەیە هـەموو میوەیـەك ڕەگـەزی نێـر و مـێ دەردەخـات : ڕاستییەك کە لە قورئاندا باس کراوە.

لەهەندێك جۆردا، میوەکە لە گوڵی نەپیتێنراوەوە دروست دەبێت بۆنمونـە مـۆز و هەنـدێك جـۆری ئـەناناس و هـەنجیر و پرتـەقاڵ و ترێ. ئەوانەش هەندێك شێوازی ڕەگەزیی تایبەتمەندیان هەیە.

**هەمووشتێك بەشێوەی جووت دروستکراوە**

﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ... ﴿٤٩﴾ ﴾الـذاريات، واتـە : لـە هـەموو شتێك جووتمان دروستکردووە.

ئەم دێڕە دڵنیاییەك دەربارەی هەموو شتێك دەبەخشێت. جگە لە مرۆڤ، ئاژەڵ، ڕووەك وە میوە لەوانەیە شتی تریش بگرێتـەوە وەك کارەبا کـە ئەتۆمـەکانی لـە بارگـەی پـۆزەتیڤی پرۆتـۆن و بارگەی نێگەتیڤی ئەلیکترۆن پێك دێن.

﴿ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾یس،واتە : پاکی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە هەموو

شتێکی بەشێوەی جووت بەدیهێناوە، لەخۆشیاندا (مرۆڤەکان) وە لەوانەشداکە نایزانن.

لەم دەقەدا قورئان ئاماژەبەوەدەکات کە هەموو شتێك بەشێوەی جووت دروست بووە لەو شتانەی کە مرۆڤ ئێستا دەیانزانێت و ئەوانەشی کە نایانزانێت و لەداهاتوودا دەیاندۆزێتەوە.

## ٨. گیانەوەرزانی...

# ئاژەڵ و باڵندەکان بەشێوەی کۆمەڵگە دەژین

﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُم... ﴿٣٨﴾ ﴾الأنعام

واتە : هیچ ئاژەڵێك نیە لەسەر زەوی وە هیچ باڵندەیەکیش کە بە باڵەکانی بفڕێت کە وەکو ئێوە کۆمەڵەیەك یان گەلێك نەبن.

لەتوێژینەوەکانەوە دەرکەوتووە کە ئاژەڵ و باڵندەکان بەشێوەی کۆمەڵ دەژین، بەجۆرێك کە ڕێکخستن لە ناو خۆیاندا دەکەن و ژیان وکارکردنیانبەیەکەوەیە.

فڕینی باڵندەکان:

﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾النحل، واتە : ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە کە چۆن لەناوەڕاستی ئاسماندا بارهێنراون بۆ فڕین؟ کەس نیە لەجێی خۆیانبیانهێڵێتەوە جگە لە الله. بەڕاستی لەمەدا بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی کە باوەڕدەهێنن.

دەقێکی تریش باسی باڵندەکان دەکات و دەڵێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾﴾الملك، واتە : ئایا سەرنجیان نەداوە لەو باڵندانەی کە بە سەریانەوەن چۆن باڵەکانیان بڵاودەکەنەوە و لێکیان دەنێن؟ ئەوانە جگەلەخوای گەورە کەسی تر لە شوێنی خۆیان جێگریان ناکات. بەڕاستی ئەو بەهەموو شتێك بینایە.

زاراوەی عەرەبی (أمسك) لەڕووی وێژەییەوە واتا : گرتنی دەستی کەسێك، هەڵگرتن و گرتنی پشتی کەسێك، ئەوەش بیرۆکەی ئەوەی تیایە کە خوای گەورە بە دەسەڵاتی خۆی باڵندەکان ڕاگیردەکات. ئەم دەقانەش پشت بەستنی تەواوی باڵندەکان بەیاساکانی سروشەوە دووپاتدەکەنەوە. داتاکانی زانستی نویێ نیشانیانداوە کە هەندێك باڵندە پلەیەکی بەرزی ڕێکخستن بەکاردەهێنن سەرەڕای ئەو بەرنامەیەی کە بۆ جوڵەکردنیان بۆیان دانراوە. بۆیە تەنها دەتوانریێ لەڕێگەی بوونی بەرنامەیەکی کۆچکردنەوە لە بۆماوەماددەی (جینەکانی) ئەو باڵندانەدا، کۆچی دوورودرێژ و ئاڵۆزی باڵندە لاوەکان

لێکبدرێتەوە، کە بەبێ ئەوەی هیچ ئەزمونێکی پێشینەی و هیچ ڕێنیشاندەرێکیان هەبێت گەشت دەکەن. وە دەتوانن لە ڕۆژێکی دیاریکراویشدا بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێیەوە هاتوون.

پرۆفیسۆر (Hamburger) لە پەرتووکەکەیدا بەناوی ' Powerand Fragility ' نمونەیەك دەهێنێتەوە لەسەر باڵندەی 'mutton-bird' کە لە زەریای هێمندا دەژیت، ئەم باڵندەیە گەشتێك دەکات بەدرێژایی ۲٤,۰۰۰ کم لەسەرشێوەی ژمارەی (۸)ی ئینگلیزی. گەشتەکە لە ماوەی نزیکەی ٦ مانگدا ئەنجامدەدات بەڵام کە لەوێوە دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی پێشووی ماوەی ئەوپەڕی یەك هەفتە یان کەمتر دەخایەنێت. ئەم زانیارییە ئاڵۆزانەش بۆ گەشتێکی لەم جۆرە پێویستە لە کۆئەندامی دەماری ئەو باڵندانە بوونی هەبێت. ئەو باڵندانە بەشێوازێکی زۆر ورد بەرنامەڕێژکراون. کەواتە ئایا پێویست نیە کە ئێمە بەلایەنی کەمەوە بەرنامەدانەری ئەمە بناسین کە کێیە ؟

**هەنگ و لێهاتوویيەکەی:**

﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ...﴿٦٩﴾ ﴾النحل، واتە : وە پەروەردگارت بە هەنگی فەرموو کە لە چیاکاندا خانەکانی دروست بکات، وە لە درەخت و ئەو شوێنانەشی کەمرۆڤ بۆی دابین دەکات. وە لە هەموو جۆرە بەروبومێك بخوات، وە پێمان ڕاگەیاند کە ئەو نەخشانەی کە پەروەردگارت بۆیکێشاویت بە ملکەچییەوە ئەنجامی بدە.

(Von-Frisch) لە ساڵی ۱۹۷۳دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت بەهۆی توێژینەوەکەی لەسەر هەڵسوکەوت و پەیوەندیی نێوان هەنگەکان. هەر هەنگێك، دوای ئەوەی کە گوڵێك یان باخچەیەکی نوێ دەدۆزێتەوە، دەگەڕێتەوە و ڕێگە و نەخشەی ئەو شوێنە بە هاوڕێ هەنگەکانی تری ڕادەگەیەنێت. ئەمەش بە 'سەمای هەنگ' ناسراوە. مانای ئەو جوڵانەی کە ئەم جانەوەرانە بەکاری دەهێنن بۆ گواستنەوەی زانیاری لە نێوان کرێکارە هەنگەکان، بەشێوازێکی زانستی و لەڕێگەی وێنەگرتن و چەند ڕێگەیەکی

ترەوە دۆزرانەوە. قورئانیش لەسەرەوە باسی ئەوەدەکات کە چۆن هەنگ بەلێهاتوویەکەیەوە ڕێگەکانی پەروەردگاری دەدۆزێتەوە.

لەسەرەوە هەنگ بە مێ باسکراوە (فَٱسْلُكِي وَكُلِي )، واتا ئەو هەنگەی کە ماڵەوە جێدەهێڵێت بۆ کۆکردنەوەی خۆراک هەنگی مێینەیە. یان بە واتایەکی تر، سەرباز یان کرێکارەکە مێینەیە.

لەشانۆی 'Henry the fourth'ی شکسپیردا ، هەندێك لە کەسایەتییەکان باسی هەنگ دەکەن کە پێکهاتوون لە کۆمەڵێك سەرباز و پاشایەکیان هەیە. ئەوەش لە سەردەمی شکسپیردا بیروباوەڕی ئەو خەڵکە بوو. پێیان وابوو کە هەنگە کرێکارەکان نێرینەن و کە دەڕۆنەوە ماڵەوە ئەوە کارەکەیان بۆ پاشاکە باس دەکەن، بەڵام ئەمە هەڵەیە، کرێکارەکان مێینەن و کارەکانیشیان بۆ پاشا ناگێڕنەوە بەڵکو بۆ شاژنی دەگێڕنەوە. ئەوەش پێویستی لێکۆڵینەوەی پێشکەوتووبوو لەماوەی ٣٠٠ ساڵی ڕابردوو بۆ ئەوەی بزانرێت.

**خانووی جاڵجاڵۆکە، خانووە لاوازەکە:**

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ﴾

العنكبوت،واتە : نمونەی ئەوانەی کە جگە لە الله کەسانی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان وەك جاڵجاڵۆکە وایە، کە ماڵەکەی دروستدەکات، بەڕاستی لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە، ئەگەر بیانزانییبایە.

سەرەڕای وەسفێکی فیزیایی بۆ تۆڕی جاڵجاڵۆکە بە خانوویەکی زۆر بێ هێز و نەرم و لاواز، قورئان باسی لاوازی خێزانی (ماڵ)ی جاڵجۆڵەکەش دەکات، کە تیایدا مێینەکە نێرینەکە دەکوژێت (دواتریش بێچووەکان دایکەکەیان دەکوژن)[1].

ئەم ئایەتەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە داوای پاڵپشتی بۆ ئەم دنیا و دنیای دواتر جگە لە خوا دەکەن.

[1] وەرگێڕ

**شێوەی ژیان و پەیوەندی نێوان مێروولەکان:**

﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾النمل، واتە : هەرچی سەرباز و لەشکری سولەیمانە بە پەری و مرۆڤ و باڵندەوە کۆکرانەوە و بەڕیز و ڕێك و پێکی ڕێکخران. تائەوکاتەی گەیشتنە دۆڵی مێرولە، مێرولەیەك هاواری کرد و وتی : ئەی مێروولەکان بڕۆنەوە نیشتنگەکانتان، نەوەکسولەیمان و لەشکرەکەی تێکتانبشکێنن (وەك شوشە) بێ ئەوەی هەست پێ بکەن.

کاتی خۆی خەڵکی گاڵتەیان بە قورئان دەکرد و دەیانوت کە قورئان پەرتوکێکە تەنها چیرۆکی ئەفسانەیی تێدایە و ئەوەی تێداهاتووە کە مێروولەکان قسە لەگەڵ یەکتری دەکەن و پەیامی گرنگ لەنێوان یەکتریدا دەگۆڕنەوە. بەڵام لەماوەی ڕابردوودا توێژینەوەکان کۆمەڵێك ڕایستییان دەربارەی شێوازی ژیانی مێروولەکان دەرخست، کە پێشتر مرۆڤ نەیدەزانی. توێژینەوەکان دەریانخست کە لەنێوان ئاژەڵاندا یان مێرووەکاندا مێروولەکان

زۆرترین لێکچوونیان هەیە لە شێوازی ژیانیاندا لەگەڵ مرۆڤدا.
ئەمەش لەم دۆزینەوانەی خوارەوەدا دەربارەی مێوولەکان زیاتر دەردەکەوێت :

١. مێروولەکان وەك مرۆڤ مردووەکانیان دەشارنەوە.

٢. مێروولـــەکان سیســـتمێکی زۆر پێشـــکەوتوویان هەیـــە لەدابەشـــکردنی کارەکانیانـــدا، بـــەجۆرێك بەڕێوەبـــەر و سەرپەرشتیار و چاودێر و کرێکار دەگرێتەوە.

٣. ماوەماوە جارێك چاوپێکەوتن ئەنجام دەدەن و قسەدەکەن.

٤. شـێوازێکی پێشـکەوتوی پەیوەنـدیکردنیان هەیـە لـەنێوان خۆیاندا.

٥. لـەماوەی ڕێکخـراودا کـاری بـازاڕداری دەکـەن تـا کـەل و پەلەکانیان ئاڵوگۆڕبکەن.

٦. لەزسـتاندا دانەوێڵـەکانیان هەڵـدەگرن، وەئەگـەر دانەوێڵەکـە گۆپکـە بکـات، ئەوەڕەگەکـەی دەبڕنـەوە، وەك ئـەوەی بـزانن کـە گەشـەی ئـەو دانەوێڵەیـە دەبێتـە هـۆی خراپبـوونی. وە ئەگـەر دانەوێڵە هەڵگیراوەکە تەڕ ببێت بەهۆی بارانەوە ئەوە دەیبەنە بەر

**تیشکی خۆر تا وشک ببێتەوە، کە وشک بۆوە، دەیبەنەوە ژوورەوە چونکە دەزانن ئەگەر دانەوێڵەکە تەڕبێت ئەوە ڕەگەکانی گەشەدەکەن و ئەوەش دەبێتە هۆی لەناوچوونیان.**

## ٩.پزیشکی...

## هەنگوین چارەسەرێک بۆ مرۆڤایەتی

هەنگ شیلەی چەندین جۆری جیاواز لەمێرووەکان دەمژێت و لەناو لەشیدا دەیکات بە هەنگوین وە لەناو خانە واکسییەکانیدا هەڵیدەگرێت. تەنها لەماوەی ئەم دوو سەدەیەی دواییدا مرۆڤ ئەوەی زانیوە کە هەنگ لەناو سکیدا هەنگوین هەڵدەگرێت، لەکاتێکدا ئەو ڕاستییە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە قورئاندا باسکراوە لەم دەقەدا :

﴿... يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ ... ﴿٦٩﴾﴾النحل

واتە : لەناو سکی ئەو هەنگانەوە شلەیەکی فرەڕەنگ دێتە دەرە کە شیفای تێدایە بۆ خەڵکی.

ئێمە تازە بۆمان دەرکەوتووە کە هەنگوین تایبەتمەندی سارێژکردنی هەیە و وەك دژەمێروو بەکاردێت. ڕووسەکان لە جەنگی جیهانی دووهەمدا هەنگوینیان دەخستە سەربرینەکانیان. هەنگوینەکەش برینەکەی بە شێداری دەهێشتەوە و دوایی کە چاك دەبووەوە، زۆرکەم شوێنەواری

بـرینی پێوەدیـاردەبوو. وە بـەهۆی زۆری چـڕییەکەیەوە، هـیچ کەڕوویەك یان بەکتریایەك ناتوانێت لەناو هەنگویندا گەشەبکات. ئەمـەش زۆربـەڕوونی دەرکـەوت لـە نزیکـەی ٢٢ نەخۆشـی بـێ چارەسەری سنگ و ئەڵزایمەر .. لە ئینگلتەرا کە لەلایەن خوشکە Carole ەوە چارەسەرکران، کە پەرستارێك بوو، (propolis)ی بـەکارهێنا، کـە هەنگـەکان شـانەکانیانی پێدادەپۆشـن دژی بەکتریا[1] .

ئەگەر کەسێك هەستیاری هەبێت بۆ ڕووەکێکی دیـاریکراو، ئـەوە دەکرێـت هـەنگوینی لـەم ڕووەکـەوە پێبـدرێ بۆ ئـەوەی بـەرگری دروسـت بکـات بـۆ ئـەو هەسـتیارییە. هـەنگوین دەوڵەمەنـدە بـە فرەکتۆز و ڤیتامین K .

ئـەو زانیارییانـەی کـە لـە قـوڕئانـدا هـاتوون دەربـارەی هـەنگوین، لەگـەڵ بنچـینە و تایبەتمەندییـەکانی هـەنگوین، چـەندین سـەدە دوای دابەزینی قوڕئان دۆزرانەوە.

---

[1] سەرچـاوەی ئـەم زانیارییـە بریتییـە لـە شـریتێکی ڤیـدیۆ بـەناوی (ئەمـە ڕاسـتییەکەیە) : بـۆ دەسـتکەوتنی ئـەم ڤیدیۆیـە پیوەنـدی بکـە بـە دامـەزراوەی توێژینەوەی ئیسلامی.

## ١٠. فیسیۆلۆجی...

## سوڕی خوێن و شیر

قورئان ٦٠٠ ساڵ بەر لە باسکردنی سوڕی خوێن لەلایەن ابن نفیس ەوە دابەزی، وە ١٠٠٠ ساڵیش بەر لەوەی کە ویلیام هاروی ئەم دۆزینەوەیە بگەیەنێتە ڕۆژئاوا. تەنانەت سێ سەدە پێش ئەوەی بزانرێت کە چی لە ڕیخۆڵەکاندا ڕوودەدات بۆ ئەوەی دڵنیاببنەوە لەوەی کە ئەندامەکان لەڕێگەی هەرسکردن و هەڵمژینەوە خۆراکیان پێدەدرێت، دێڕێک لە قورئاندا باسی سەرچاوەی پێکهاتەکانی شیر دەکات، بەو شێوەیەی کە ڕوودەدات.

بۆ تێگەیشتن لە دێڕەکەی قورئان کە باس لەم شتانەی سەرەوەدەکات، پێویستە ئەوە بزانین کە چەند کارلێکێکی کیمیایی لە ڕیخۆڵەکاندا ڕوودەدەن و لەوێشەوە ئەو ماددانەی کە لەخۆراکەوە بەدەستخراون، دەگوێزرێنەوە بۆناو خوێن لە ڕێگەی سیستەمێکی ئاڵۆزەوە: زۆرجار لەڕێگەی جگەرەوە، ئەمەش

بـەپێی سروشـتی کیمیـایی ماددەکـە دەبێـت. خـوێنیش دەیانگوازێتەوە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش، لەنێویشیاندا ئەو ڕژێنانەی کە شیردروست دەکەن.

بەشێوەیەکی سادەتر دەتوانین بڵێین، کۆمەڵێك ماددەی دیاری کـراو لـە ڕێگـەی ئامرازەکـانی ڕیخۆڵەکانـەوە دەچـنە نـاو لولەخوێنەکانی ئەم ڕیخۆڵانەوە، و دواتر لە ڕێگەی خوێنەوە بۆ ئەندامـەکانی لـەش دەگوازرێنـەوە. وە ئەگـەر لـەم دێـڕەی قوڕئـان تێبگەین ئەوە ئەم بڕگەیە فیسیۆلۆجییە زیاتر دەنرخێنرێت :

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾النحل،واتە : بەڕاستی لە ئاژەڵدا بەڵگە هەیە بۆ ئێوە کە جێگای تێڕامانە، ئێمە لەڕێگەی ئەوەی کە لەسکیاندا هەیـە، خواردنـەوەتان پێـدەدەین، کـە لـەنێوان ڕیخۆڵـەکانیان و خوێنـەوە دروسـت دەبێـت، شـیرێکی پـاك و بەچێژە بـۆ ئەوانـەی دەیخۆنەوە.

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ ﴾المؤمنون،واتە : بەڕاستی لە ئاژەڵدا بەڵگە هەیە بۆ ئێوە کە

جێگای تێڕامانە، ئێمە لەڕێگەی ئەوەی کە لەسکیاندا هەیە، خواردنەوەتانپێدەدەین، وە چەندین سودی تریشی بۆتان هەیە و لە گۆشتەکەشی دەخۆی.

باسکردنی پرۆسەی دروستبوونی شیری مانگا ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە قورئاندا بەتەواوی وەك ئەوە وایە کە لەم ماوانەی پێشووتردا زانستی فیسیۆلۆجی پێی گەیشتووە.

## ١١. کۆرپەلەزانی...

## موسوڵمانان داوای وەڵام دەکەن

کۆمەڵێك زانای موسوڵمان، لەژێر چاودێری زانایەکی بەناوبانگی یەمەنی، عبدالمجید الزندانی، ئەوزانیارییانەیان کۆکردەوە کە لەقورئان و فەرموودە دروستەکاندا[1] هاتوون دەربارەی کۆرپەلەزانی[2] و زانستەکانی تر وە وەریانگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی. دواتر شوێن ئەم فەرمایشتەی قورئان کەوتن :

﴿...فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾النحل،واتە : ئەگەر دەربارەی ئەمە زانیاریتان نیە، ئەوە پرسیار بکەن لەکەسانی خاوەن زانست.

هەموو زانیارییەکان کە لە قورئان و فەرمووده دروستەکاندا هاتوون دەربارەی کۆرپەلەزانی کۆکرانەوە، دوای ئەوەی کران بە ئینگلیزی نیشانی پرۆفیسۆر (در.) کیس مۆر (Keith Moore)

---

[1] فەرموودە یان سوننەت بریتییە لە وتە یان کردارەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

[2] کۆرپەلەزانی بریتییە لە خوێندنی گەشەی مرۆڤ بەر لە لەدایکبوونی.

دران ، پرۆفیسۆری کۆرپەلەزانی و سەرۆکی بەشی توێکاری لەزانکۆی تۆرنتۆ، لە کەنەدا. لە ئێستادا یەکێکە لە گەورەترین زاناکانی بواری کۆرپەلە زانی.

ئەم پرۆفیسۆرە داوای لێکرا کە بۆچوونی خۆی دەربڕێت دەربارەی ئەوەی کە نیشانی دراوە. ئەویش دوای ئەوەی کە زۆر بەوردی زانیارییەکانی هەڵسەنگاند وتی کە زۆربەی زانیارییەکانی ناو قورئان و فەرموودەکان دەربارەی زانستی کۆرپەلەزانی بەتەواوی لەگەڵ دۆزینەوەکانی سەردەمدا هاومانان وە هیچ تێکگیرانێك لەنێوانیاندا بوونی نیە بەهیچ شێوەیەك. وە ئەوەشی وت کە دەربارەی تەواوی و دروستێتی هەندێك لەو دێڕانە ناتوانێت هیچ بڵێت. نەیتوانی بڵێت ئەو دێڕانە ڕاستن یان نا، چونکە ئەو زانیاری نەبوو دەربارەی ئەوەی کە تیایاندا هەبوو. وە هەروەها لە زانستی ئەمڕۆشدا هیچ باسکردنێك دەربارەی ئەم دێڕانە بوونی نیە.

خوای گەورە لە یەکێك لە ئایەتەکاندا دەفەرموێت:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ﴾العلق،واتە : بخوێنە، بەناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، مرۆڤی دروستکردووە لە پارچەیەك خوێنی مەییو.

زاراوەی عەرەبی ، علق، لەپاڵ ئەوەی کە بەمانای خوێنی مەییو دێت، مانای تریشی هەیە وەك: شتێك کە خۆی هەڵواسێت، پێکهاتەیەکی شێوە زەروو.

دکتۆر کیس مۆر هیچ زانیارییەکی دەربارەی ئەوە نەبوو کە ئایا کۆرپەلە لەسەرەتادا وەك زەروویەك دەردەکەوێت یان نا. بۆ تاقیکردنەوەی ئەمە، هەڵسا بە لێکۆڵینەوەکردن لەسەر ماوەی سەرەتای کۆرپەلە لەژێر مایکرۆسکۆپێکی زۆر بەهێزدا و بەراوردی کرد بە شێوەی زەروو. لێکچوونی نێوان ئەم دووانە دکتۆر کیس مۆری توشی سەرسوڕمان کرد.

بەم شێوەیە، لەڕێگەی قورئانەوە، ئەو زانیاری زیاتری دەستکەوت دەربارەی کۆرپەلەزانی، کە تا ئەوکاتە نەیزانیبوو.

دکتۆر کیس مۆر وەڵامی نزیکەی هەشتا پرسیاری دایەوە دەربارەی کۆرپەلەزانی کە لە قورئان و فەرموودەکاندا باسکرابوون. و ئەوەی دەرخست کە زانیارییەکانی قورئان و فەرموودەکان بەتەواوی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە زانستی سەردەم پێی گەیشتووە، وە وتی : "ئەگەر ئەم پرسیارانەم سی ساڵ لەمەوبەر لێبکرایە، ئەوە نەمدەتوانی وەڵامی نیوەیان بدەمەوە لەبەر نەبوونی زانیاری زانستی دەربارەیان".

لەساڵی ١٩٨١ دا، لە حەوتەمین کۆنفرانسی پزیشکیدا لە دمام، لە سعودییەدا، دکتۆر کیس مۆر وتی : "زۆر جێیخۆشحاڵییە بۆمن کە توانیومە یارمەتیدەربم لە سەلماندنی زانیارییەکانی قورئان دەربارەی گەشەی مرۆڤ. وە لام ئاشکرایە کە ئەم زانیارییانە دەبێ لەلایەن خوا یان الله وە بۆ موحەممەد نێردرابێ، لەبەرئەوەی هیچ کام لەم زانیارییانە نەدۆزرابوونەوە تاچەندین سەدە دوای دابەزینی قورئان. ئەمەش ئەوەم بۆ دەسەلمێنێ کە موحەممەد دەبێ نێردراوی خوا یان الله بێت".

دکتۆر کیس مۆر پێشتر کتێبێکی هەبوو بەناوی ' The developing human' دوای ئەوەی زانیارییەکانی قورئانی پێگەیشت،لە ساڵی ١٩٨٢دا سێهەم چاپی پەرتووکەکەی بڵاوکردەوە. وە پەرتووکەکەی خەڵاتی باشترین پەرتوکی وەرگرت کە لەلایەن یەك کەسەوە نوسرابێت. پەرتووکەکەی وەرگێڕدرا بۆ چەندین زمان لە جیهاندا و لە چەندین زانکۆی جیهان بە مەنهەج لە کۆرپەلەزانی دەخوێنرا لە ساڵی یەکەمی کۆلێژی پزیشکی.

دکتۆر (Joe Leigh Simpson) ، سەرۆکی بەشی ژنان و مناڵبوون، لە کۆلێژی پزیشکی بایلۆر، لە Houston، دەڵێت :"ئەم وتانەی موحەممەد، ناکرێ لەسەر بنەمای ئەوزانیارییانە وترابن کە ئەوکاتە بەردەست بووە بۆ نوسەرەکە(واتە سەدەی ٧). ئەمەش دەمانگەیەنێ بەوەی کە نەك تەنها تێکگیران نەبووە لەنێوان زانست و ویندا (مەبەستی ئیسلامە)، بەڵکو ئەو ڕاستییەی کە دین (ئیسلام) ڕێنیشاندەری زانستی کردووە بە زیادکردنی چەندین دەق بۆ ئەو زانیاریانەی کە پێشتر زانست پێیان

گەیشتووە. دەق هەیە لە قورئاندا کە دوای چەندین زانست سەلماندوویەتی ڕاستە ئەمەش دەرخەری ئەوەیە کە ئەوزانیارییەی لەقورئاندا هەیە لەلایەن خواوە هاتووە".

دڵۆپێک کە لەنێوان ئێسکەکانی پشت و پەراسووەکانەوە دەرچووە﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾﴾الطارق،واتە : با ئادەمیزاد سەیرکات کە لەچی بەدیهێنراوە، لە ئاوێکی هەڵقوڵاوەوە بەدیهێنراوە کە لە نێوان ئێسکەکانی پشت وپەراسووەکانەوە دەرچووە (کۆچی کردووە).

لەقۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلەدا، ئەندامەکانی زاوزێی نێر و مێ، گونەکان و هێلکەدانەکان، لە نزیک گورچیلەوە دەست بەدروستبوون دەکەن لەنێوان بڕبڕەی پشت وە پەراسووی یانزە و دوانزە. دواتر بەرەو خوارەوە دادەبەزن: هێلکەدانەکان لە حەوزدا دەمێننەوە لەکاتێکدا گونەکان پێش لەدایکبوون بەردەوام دەبن لە دابەزینیان تا دەگەنە تورەکەی گون لەڕێگەی ئینگواینەڵ کەناڵەوە.تەنانەت دوای گەشەشیان ئەم ئەندامانە پاڵپشتی خوێن و دەماریان لە لایەن خوێنبەری گەورەی

سکەوەیە کە ئەویش لەنێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکاندایە. وە لیمف و خوێنی خوێنهێنەرەکانیشی بۆ هەمان ناوچە دەبردرێن.

نوتفە-بڕێکی کەم لە ئاو :

دەقە پیرۆزەکانی قورئان لە یانزە شوێندا باسی ئەوەدەکەن کە مرۆڤ لە نوتفەوە دروستکراوە، کە بەمانای بڕێکی کەم لە ئاو یان تکەئاوێك دێت کە دوای بەتاڵکردنی کوپێك دەمێنێتەوە. لە چەندین دەقی قورئاندا ئەمە باسکراوە وەك ٢٢:٥ ، ٢٣:١٣[١].

زانست سەلماندوویەتی کە تەنها یەك تۆو لەنێوان نزیکەی سێ ملیۆن تۆودا هێلکە دەپیتێنێت. واتە ٣/١ ملیۆن بەش یان ٠.٠٠٠٠٣٪ ی ئەو تۆوانەی کە دەردراون هێلکە دەپیتێنێت.

سولالە-پوختەیەك لە ئاو :

﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ۝٨ ﴾السجدة، واتە : پاشان لە پوختەیەك لە ئاوی لاوازەوە وەچەکەیمان دروست کرد.

---

[١] هەمان شت لەقورئاندا باسکراوە لە ١٦:٤، ١٨:٣٧، ٣٥:١١، ٣٦:٧٧، ٤٠:٦٧، ٥٣:٤٦، ٧٥:٣٧، ٧٦:٢، ٨٠:١٩.

وشەی عەرەبی سولالە بەمانای پوختەیەك یان باشترین بەشی لە مەبلەغێکدا دێت. ئەوەمان زانی کە تەنها یەك تۆو پێویستە بۆ پیتاندنی هێلکە، لەنێوان چەندین ملیۆن کە پیاو بەرهەمی دەهێنێت. ئەم تاکە تۆوەش لەناو ئەم ملیۆنەدا لە قورئاندا بە سولالە ناوبراوە. ئەوەش دەزانین کە تەنها یەك هێلکە دەپیتێنرێت لەنێوان دەیان هەزار کەلەلایەن ئافرەتەوە بەرهەمدەهێنرێن. ئەم تاکە هێلکەیەش کە لەنێوان ئەم چەند هەزار هێلکەیەدا لەقورئاندا ناوبراوە بە سولالە. ئەم وشەیە هەروەها بەمانای ڕاکێشانێکی توند لە شلەیەکەوە دێت.شلەکەش بریتیە لە ئاوی هەریەك لە پیاو و ئافرەت کە گەمیتەکانیان تێدایە. هەریەك لە هێلکە و تۆویش بەتوندی دەرهێنراون لە ژینگەکانیانەوە لە پرۆسەی پیتاندن.

**نوتفەی ئەمشاج–ئاوی تێکەڵبوو :**

زاراوەی عەرەبی نوتفەتین ئەمشاجین واتە ئاوی تێکەڵبوو. بەپێی چەند ڕاڤەکارێکی قورئان، ئاوی تێکەڵ دەگەڕێتەوە بۆ ماددەی نێر یان مێ یان ئاوەکانیان. دوای تێکەڵبوونی هەریەك لە تۆوی

پیاو و هێلکەی ئافرەت، زایگۆت هەر بە نوتفەیی دەمێنێتەوە. هەروەها دەتوانرێ ئاوی پیاو بە ئاوی تێکەڵ دابنرێ چونکە چەندین ڕژێنی جیاواز بەشداری دەکەن لەدروستکردنی چەند ماددەیەکی جیاوازدا.

بۆیە نوتفەی ئەمشاج (ئاوی تێکەڵ) هەردوو تۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو شلەیەشی کە دەورەیان دەدات.

دیاریکردنی ڕەگەز :

ڕەگەزی منداڵ بەپێی سروشتی تۆوەکە دیاریدەکرێت نەك هێلکە. ڕەگەزی منداڵ، نێر یان مێ، بەندە لەسەرئەوەی کە ئایا جووت کرۆمەسۆمی ژمارە ٢٣ لە هەردوو کرۆمۆسۆمی XX یان لە XY پێك دێت.

لەسەرەتادا، دیاریکردنی ڕەگەز لەسەرەتای پیتاندنەوە دەبێت و پشت دەبەستێت بەو کرۆمۆسۆمەی تۆو کە هێلکە دەپیتێنێت. ئەگەر تۆوێکی هەڵگری کرۆمۆسۆمی X هێلکە بپیتێنێت ئەوە منداڵەکە مێ دەردەچێت وە ئەگەر تۆوەکە هەڵگری کرۆمۆسۆمی Y بێت ئەوە نێردەبێت.

﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ۝٤٥ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ۝٤٦ ﴾النجم،

واتە : وە پەروەردگارت هەریەکە لە نێر و مێی دروستکردووە لە تۆوێك کە جێگردەبێت (لەشوێنەکەیدا).

وشەی عەرەبیِنطفة بەمانای بەشێکی کەم لەئاودێت و وشەی تمنى بە مانای دەردراو یان چێنراودێت. بۆیە نوتفە تایبەتە بە تۆو چونکە ئەویان دەردراوە. قورئان دەفەرموێت :

﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ۝٣٧ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٣٨ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ۝٣٩ ﴾القيامة، واتە : ئایا مرۆڤ دڵۆپە تۆوێك نەبووە کە ڕژێنراوە. دواتر بوو بە پارچەیەکی مەییو، دواتر دروستی کرد ڕێکوپێکی کرد. وەلەمەشەوە هەریەك لە ڕەگەزەکانی نێر و مێی دروستکرد.

لێرەدا دیسان باس لەوەکراوەتەوە کە بەشێکی کەم(دڵۆپێك) لە تۆو(بە نطفة من مني ناوبراوە) کە لە پیاوەوە دێت بەرپرسیارە لە دیاریکردنی ڕەگەز.

لە ناوچەکانی هیندستان خەسووەکان حەزدەکەن نەوەکانیان کوڕبێت تەنانەت ڕەخنەش دەگرن لە بووکەکانیان ئەگەر منداڵەکەیان کوڕنەبێت. بەڵام ئەوان نازانن کە ئەوەی بەرپرسیارە

لـە دیـاریکردنی ڕەگـەزی منـداڵ بریتییـە لـە تـۆوی پیـاو نـەك هێلکەی ئافرەتەکە! ئەگەر هەرگلەیی بکەن، ئەوە دەبێ گلەیی لە کوڕەکانیان بکەن، نەك بووکەکانیان، چونکە هەریەك لە قوڕئان و زانسـتیش ئـەوەیان دەرخسـتووە کـە ئـاوی پیـاو بەرپرسـە لـە ڕەگەزی منداڵەکە!

کۆرپە بە سێ ناوچەی تاریکی داپۆشراوە:

﴿ .. يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ .. ﴿٦﴾ ﴾

الزمر، واتـە : پـەروەردگارتان ئێوە لـە سکی دایکتانـدا دروست دەکـات بەچـەندین قۆنـاغی یـك لـەدوای یـەك، لـە نـاو سـێ ناوچەیتاریکدا.

بەپێی قسـەی دکتـۆر کـیس مـۆر، ئـەم سـێ بەشـە تاریکـەی کـە لەقوڕئاندا باسکراوە دەگەڕێتەوە بۆ هەریەك لە :

(i) دیواری پێشەوەی سکی دایك

(ii) دیواری منداڵدان

(iii) پەردەی ئەمینۆکۆریۆنی

قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾المؤمنون،

واتە : سوێند بەخوا ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لەقوڕ بەدیهێناوە، پاشان کردمان بە نوتفەیەك و لە جێگایەکی پارێزەردا جێگیرمان کرد، پاشان نوتفەکەمان کرد بە عەلەقە و ئینجا عەلەقەکەمان کرد بە موزغە و دواتر موزغەمان کرد بە عیزام(ئێسکەپەیکەر) و دواتریش ئێسکەپەییکەرەکەمان بە ماسولکە داپۆشی، پاشان گۆڕیمان وامان لێکرد گەشەبکات بۆ شێوەیەکی تایبەت بەخۆی(شێوەی مرۆڤ)، بەڕاستی خوای مەزن بەرز و پیرۆز و موبارەکە و چاکترین بەدیهێنەرە.

لەم دەقانەدا پەروەردگار ئاماژە بەوەدەکات کە مرۆڤ لە بەشێکی زۆرکەم لە ئاو دروستکراوە کە لە شوێنی حەوانەوەی دانراوە، وە بە توندا جێگیرکراوە (کە وشەی عەرەبیقرار مکین ی بۆ بەکارهاتووە).منداڵدان لە پشتەوە بەباشی پارێزگاری لێدەکرێت بەهۆی بربڕەی پشتەوە کە ئەویش لەلایەن ماسولکەکانی

پشتەوە بەباشی پارێزگاری لێدەکرێت. هەروەها کۆرپەلە لەلایەن پەردەی ئەمینۆسیشەوە پارێزگاری لێدەکرێت کە ماددەی ئەمینۆسی لەخۆدەگرێت. بەم شێوەیە کۆرپەلە ژینگەیەکی پارێزەری باشی هەیە.

ئەم ئاوە کەمە دەگۆڕدرێت بۆ عەلەقە ئەوەش مانای شتێك دەگەیەنێت کە لکێنراوە. هەروەها بەمانای پێکهاتەیەکی شێوە زەرووش دێت. هەردوو ماناکەش بەتەواوی لەڕووی زانستییەوە پەسند دەکرێن چونکە کۆرپەلە لەسەرەتاوە خۆی بە دیواری منداڵدانەوە دەلکێنێت و شێوەکەشی وەکو زەروویەك وایە. وە هەروەها وەکو زەرووش هەڵسوکەوت دەکات(کە خوێن دەمژێت) و خوێن لە دایکیەوە وەردەگرێت لە ڕێگەی ناوکەپەتکەوە.

مانای سێهەمی زراوەی عەلەق بریتییە لە پارچەیەك خوێنی مەییو. لەماوەی ئەم قۆناغەی عەلەقەدا، کە لەنێوان هەفتەی سێهەم بۆ چوارەمی سکپڕیدای، خوێنەکە لەناو لولەخوێنە بچووکەکاندا دەمەیێت، بۆیە منداڵەکەش شێوەی خوێنی مەییو وەردەگرێت لەگەڵ ئەوەی کە شێوەکەشی وەك زەروو وایە.

بەراوردبکە نێوان ئەوزانیارییەی کە لە قورئانداهەیە وە ئەو تێکۆشانەشی کە مرۆڤ کردوویەتی لەپێناو زانستدا.

لەساڵی ١٦٧٧، ( Hamm و Leeuwenhoek ) یەکەم زانابوون کە تۆوی پیاویان بینی لەژێر مایکرۆسکۆپدا. وە وتیان کە تۆوی پیاو وێنەیەکی زۆربچووککراوەی مرۆڤی تێدایە کە بەرەبەرە گەشەدەکات لە منداڵداندا و دواتر دەبێت بە منداڵ (بەبێ ئەوەی هێلکە هیچ ڕۆڵێکی هەبێت لە دروستبوونی منداڵ[1]). ئەمەش ناونرا بیردۆزی هەڵکۆڵین. بەڵام دواتر کەزانایان ئەوەیان دۆزییەوە کە هێلکە قەبارەکەی گەورەترە لە تۆو، ئەوەبوو لەلایەن زانایانی وەك دی گراف و هەندێکی ترەوە وترا کە منداڵ بەشێوەیەکی بچووککراوە لە هێلکەدایە و لەوەوە دروست دەبێت. دواتر، لەسەدەی ١٨دا، مۆپێرتویس پێشنیاری بیردۆزی گواستنەوەی فرەباوانیی کرد(بەم شێوەیە ئەو زانیارییەی کە لەقورئاندا باسی لێوەکراوە دەربارەی بەشداری هەریەك لە ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەت لە دروست بوونی کۆرپەلە تا سەدەی

[1] وەرگێڕ

١٨یـەم نەدۆزراوەتـەوە و هـیچ کەسـێك جگـە لـە موسـڵمانان نەیاندەوت کە مرۆڤ لەم دوو ئاوە بەیەکەوە دروست دەبێت[1]).

دواتـر (علقـة) دەگۆڕدرێـت بـۆ (مضـغة) کـە واتـە (شـتێك کـە جووراوە) وە شتێکی بچوك یان بچوکترین شت کە دەتوانرێ لە دەمـدا وەك بنێشـت بجورێـت. هـەردوو لێکدانەوەکـەش لـەڕووی زانستییەوە ڕاستن. دکتۆر کیس مۆر پارچە پلاستەرێکی بچوکی هێنـا و خسـتییە سـەر شـێوە و قـەبارەی کۆرپەلـە لـە قۆنـاغی سـەرەتاییدا و بەددانـەکانی جـوی و کـردی بـە موزغـە. ئەمـەی بەراورد کرد بە سەرەتاکانی قۆناغی کۆرپەلە. جێ دانـەکانی وەك لەپـەکانی کۆرپەلـە (somites) دەردەکـەوتن کـە بریتییـە لـە سەرەتای دروستبوونی بڕبڕەی پشت.

دواتر موزغە دەگۆڕێت بۆ ئێسك(عظام). و ئێسـکیش بە گۆشت یـان ماسـولکە دادەپۆشـرێت(لحم). دواتـر الله دەیگۆڕێـت بـۆ دروستکراوێکی تر. پڕۆفیسۆر (Marshall Johnson) کە یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی ئەمریکا، وە سەرۆکی بەشی توێکاری و

[1] وەرگێڕ

بەڕێوەبەری دامەزراوەی دانیەڵە لە زانکۆی تۆمەس جێفەرسن لە فیلادلیا لە ئەمریکا، داوای لێکرا کە بۆچوونی خۆی بڵێت دەربارەی ئەو زانیاریانەی کە لەقورئاندا دەربارەی زانستی کۆرپەلەزانی هاتوون. لەسەرەتادا ئەوەی وت کە ئەو زانیارییانە ناکرێت بە ڕێکەوت بووبێت. لەوانەیە موحەممەد مایکرۆسکۆپێکی زۆر بەتواناای هەبووبێت. دواتر کە پێی وترا موحەممەد ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر بووە و مایکرۆسکۆبیش چەند سەدەیەك لەمەوبەر دروستکراوە، ئەو پێکەنی و وتی کە یەکەم مایکرۆسکۆپ کە دروستکرا تەنها دەیتوانی ١٠ ئەوەندە وێنەکان گەورەبکات و نەیدەتوانی وێنەی زۆر ڕوون نیشانبدات. دواتر وتی :"هیچ گومانێك نابینم لەوەی کە وەحی خوایی بەشداربووە لەو قورئانەی کە موحەممەد خوێندوویەتییەوە".[1]

بەپێی قسەی دکتۆر کیس مۆر، پۆلێنکردنی قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە، کەلەجیهاندا کاری پێدەکرێت، دەقیق نیە، چونکە

---

[1] سەرچاوەی ئەم وتەیە شریتێکی ڤیدیۆییە بەناوی "ئەمە ڕاستییەکەیە". بۆ دەستکەوتنی ئەم ڤیدیۆیە پیوەندی بکە بە دامەزراوەی توێژینەوەی ئیسلامی.

بەپێی بنچینەیەکی ژمارەیی قۆناغەکان دانراون، بۆنمونە قۆناغی ١ و غۆناغی ٢ و هتد.لەلایەکی تریشەوە، ئەو دابەشکارییەی کە قورئان بۆ غۆناغەکانی داناوە، بەندە لەسەر ئەو تایبەتمەندێتییە دیار و جیاکەرەوانەی شێوە یان وێنەی کۆرپەلەکە، کە پیایاندا تێپەڕدەبێت. ئەمەش پشت بە قۆناغە جیاکاری پێش لەدایکبوون دەبەستێت و وەسفێکی وردی زانستییانە دەبەخشێت کە هەم گشتگیرە و هەم لەگەڵ زانستی سەردەمدا یەکدەگرێتەوە.

قۆناغەکانی گەشەی مرۆڤ لەم دەقانەی قورئاندا باس کراون :

﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾القيامة، واتە : ئایا مرۆڤ دڵۆپە تۆوێك نەبووە کە ڕژێنراوە. دواتر بوو بە پارچەیەکی مەییو، دواتر دروستی کرد ڕێکوپێکی کرد. وەلەمەشەوە هەریەك لە ڕەگەزەکانی نێر و مێی دروستکرد.

﴿ الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ ﴾الإنفطار

واتە : ئەو پەروەردگارەی کە تۆی ڕاستکردەوە و گۆڕانکاری تیاداکردی و ئەو شێوەیەی پێ بەخشی کە ویستیلەسەربووە.

کۆرپەلەکە بەشێکی دروستبووە و بەشێکی تری دروست نەبووە لە قۆناغی موزغەدا، ئەگەر کۆرپەلەکە ببڕدرێت و بکرێتە بەش بەش، ئەوە دەبینین کە زۆربەی ئەندامەکان دروست بوون بەڵام هەندێکیان ماون کە بەتەواوی دروست نەبوون.

بەپێی وتەی پرۆفیسۆر (Johnson)، ئەگەر کۆرپەلە وا وەسف بکرێت کە بەتەواوی دروست بووە ئەوە وەسفەکەمان تەنها ئەو بەشانە دەگرێتەوە کە لەمەوپێش دروست بووە، وە ئەگەر وا وەسفی بکەین کە تەواو دروست نەبووە ئەوە وەسفەکەمان ئەوانە دەگرێتەوە کە تا ئێستا دەستیان بەدروستبوون نەکردووە. کەواتە کۆرپەلە بەتەواوی دروست بووە یان نا؟هیچ وەسفێك نیە باشتربێت بۆ ئەو قۆناغە لەوەی کە قورئان کردوویەتی "بەشێکی دروست بووە و بەشێکی دروست نەبووە" وەك لەو ئایەتەدا باسکراوە:

﴿...خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ...﴿٥﴾﴾الحج، واتە : ئێوەمان لەخۆڵ دروست کردووە پاشان لە تۆوێك پاشان لە زەرروویەکی مەییو پاشان لە

پارچە گۆشتێك کە بەشێکیدروست بووە و بەشێکیشی دروست نەبووە تا بۆتان ڕوونکەینەوە.

لەڕووی زانستییەوە دەزانین کە لەم قۆناغەی سەرەتای گەشەکردندا کۆمەڵێك خانە هەن کە جیاکارییان کردووە و هەندێك خانەش هەن کە تا ئێستا جیاکارییان نەکردووە- هەندێك ئەندام دروست بوون و هەندێکی تریش دروست نەبوون.

هەستی بینین و بیستن :

یەکەم هەست کە لە کۆرپەلەدا گەشە دەکات بریتییە لە هەستی بیستن. کۆرپەلە لەدوای هەفتەی ٢٤رەمەوە دەتوانێت هەست بەدەنگ بکات. دواتر هەستی بیستن لە هەفتەی ٢٨تەمدا گەشەدەکات و تۆڕی چاو هەستیاری بۆ ڕووناکی پەیدا دەکات.

لە قورئاندا ئەمە ڕوونکراوەتەوە:

﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ...﴿٩﴾﴾السجدة، واتە : وە توانای بیستن و بینین و بەخشینی پێبەخشین.

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾﴾الإنسان، واتە : بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان دروستکردووە لە ئاوێکی تێکەڵ

بۆ ئەوەی تاقیبکەینەوە وە توانای بیستن و بینینمانپێبەخشی.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾المؤمنون

واتە : وە ئەو پەروەردگارەتانە کە بیستن و بینین و هەستکردن و تێگەیشتنی بۆ دروستکردوون، زۆر کەم سوپاسگوزاریخوا دەکەن!

لە هەموو ئەم دەقانەدا هەستی بیستن پێش هەستی بینین باسی لێکراوە. کەواتە وەسفەکانی قورئان بەتەواوی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ دۆزینەوەکانی سەردەم دەربارەی کۆرپەلە.

## ١٢. زانست بەگشتی...

﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ ﴾القيامة

واتە : ئایا مرۆڤ واگومان دەبات کە ئێمە ئێسکەکانی کۆناکەینەوە؟ نەخێر، ئێمە توانامان هەیە کە بەشێوازێکی زۆر وردنەخشەی سەر نوکی پەنجەکانی بەدی بهێنینەوە.

بێ بڕواکان مناقەشەی ئەوەدەکەن کە چۆن مرۆڤ دوای مردنی زیندوو دەبێتەوە لەکاتێکدا ئێسکەکانی لەیەکتری جیادەبنەوە وە چۆن مرۆڤەکان دەناسرێنەوە دوای زیندووبوونەوە. خوای بەرز و بڵند وەڵامییان دەداتەوە کە نەك تەنها ئێسکەکانیان کۆدەکاتەوە بەڵکو دەتوانێت زۆربەباشی سەری پەنجەکانمان دروست بکاتەوە.

بۆچی لە قورئاندا کە باسی ناسینەوە و جیاکردنەوەی مرۆڤ دەکات، بە شێوازێکی تایبەت باسی سەری پەنجەکان دەکات؟ لەساڵی ١٩٨٠، دوای ئەوەی لەلایەن بەڕێز (Francis Golt)ەوە توێژینەوەی لەسەرکرا، سەرەپەنجە بووە ڕێگەیەکی زانستی بۆ

ناسـینەوەی مـرۆڤ. هـەرگیز دووکـەس لەجیهانـدا هـەمان سەرەپەنجەیان نابێت، تەنانەت ئەگەر دووانەی لێکچووش بن. لەبـەر ئەمەشـە کـە پـۆلیس لـە هـەموو وڵاتێکـدا سـەرەپەنجە بەکاردەهێنێت بۆ دۆزینەوەی تاوانباران.

چوارسـەد سـاڵ لەمەوبـەر، کـێ دەربـارەی لێکنەچـوونی سەرەپەنجەی مرۆڤەکان زانیاری هەبوو؟ بێگومان هیچ کەسێك جگە لە بەدیهێنەر خۆی نەبێت.

بوونی هەستە ئازارەکان لە پێستدا :

پێشتر بڕوا وابوو کە هەستکردن و ئازار تەنها پشت بە مێشك دەبەستێت. بەڵام لە توێژینـەوەکانی ئـەم دواییـە سەلمێنرا کـە ئازارەوەرگرەکان لە پێستدا بوونیان هەیە، کە بەبێ ئەوانە مرۆڤ ناتوانێ هەست بەئازاربکات.

کاتێك دکتۆرێك هەڵسەنگاندن بۆ نەخۆشێك دەکات کە توشی سوتان بووە، ئـەو پلـەی سـوتانەکە بـە بـەکارهێنانی پارچـە دەرزییەك لەسـەر پێستەکەی دیاری دەکات. ئەگـەر نەخۆشـەکە هەسـت بـە ئازاربکـات، دکتۆرەکـە دڵخـۆش دەبێـت، چـونکە

نیشانەی ئەوەیە کە سوتانەکە تەنها بەشی سەرەوەی پێستی گرتوەتەوە و ئازارەوەرگرەکان ساغن. بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە هەست بە ئازارنەکات، ئەوە سوتانەکە چینی ژێرەوەی پێستی گرتووەتەوە و قوڵە وە ئازارە وەرگرەکان تێکشکاون.

لە قورئانیشدا بەشێوازێکی ڕوون ئاماژە بۆ بوونی ئازارەوەرگرەکان لە پێستدا دەکات لەم دەقەدا :

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾النساء،

واتە : ئەوانەی کە بێباوەڕدەبن بە بەڵگەکانمان ئەوە لەداهاتوودا دەیانخەینە ناو ئاگرەوە، هەرکاتێك پێستەکەیان سوتا ودامالرا لەبەریاندا ئەوە پێستێکی تریان بەبەردا دەکەین بۆ ئەوەی سزا بچێژن، بەڕاستی الله بەتوانا و کاربەجێیە.

پرۆفیسۆر (Tagatat Tejasen) سەرۆکی بەشی توێکاری لە زانکۆی چیانگ مای لە تایلاند، کاتێکی زۆری بەسەربرد بۆ توێژینەوە لەسەر ئازارە وەرگرەکان. سەرەتا نەیدەزانی کە قورئان ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر ئەمەی باسکردووە. ئەوەبوو دواتر

ئەم دەقەی قورئانی پشتڕاستکردەوە. ئەو پرۆفیسۆرە ئەوەندە کاریگەربوو بەو لێکدانەوە ورد و زانستییەی قورئان، بەجۆرێك کە لە ٨تەمین کۆنفرانسی پزیشکی کە لە ریازی سعودیە بەسترا دەربارەی ئاماژە زانستییەکانی قورئان و سوننە، بە شانازییەوە بەبەرچاوی خەڵکی وتی :لآإلهَ إلّا اللهُ مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللهِ

هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە الله، موحەممەدیش نێردراوی الله یە.

## ١٣.پوختە....

بەدڵنیاییەوە ڕێکی و یەککگرتنەوەی قورئان لەگەڵ زانستدا ئەم ڕوونکردنەوەیەی قورئان دەردەخەن کە دەفەرموێت:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾فصلت، واتە : زۆر بەزوویی بەڵگەکانمانیان نیشان دەدەین دەربارەی ناوچەکانی( زەوی )و لە خودی خۆشیاندا تا ئەوکاتەی کەبۆیان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم دینە ڕاستە، ئایا ئەوەندە بەس نیە کە پەروەردگارت بەسەر هەمووشتێك بەئاگایە؟

لەم دەقەدا قورئان داوا لە هەموو مرۆڤایەتی دەکات کە بیربکەنەوە و تێبفکرن لە بەدیهێنانی گەردوون :

﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران، واتە : بەڕاستی لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، وە ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی کە خاوەنژیرین.

بەڵگە زانستییەکانی قورئان ئەوەمان بۆڕوون دەکەنەوە کە قورئان وەحییە. هیچ مرۆڤێك نەیدەتوانی چوارده سەده لەمەوبەر پەرتووکێك بنوسێت کە ئەم بەڵگە زانستییانەی تێدابێت.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، قورئان پەرتوکی زانست نیە بەڵکو پەرتوکی نیشانەکانە. ئەم نیشانانە وا لەمرۆڤ دەکەن کە هۆکاری بوونی لەسەر زەوی بزانێ، وە وای لێ دەکەن کە بەشێوازێکی باش ژیانی لەسروشتدا بەسەربات. بێگومان قورئان پەیامێکە لەلایەن خواوە، بەدیهێنەر و بەردەوامیپێدەری گەردوون. هەمان ئەوپەیامەی تاکی و بێ هاوتایی خوا هەڵدەگرێت کە هەموو پێغەمبەرەکانی تر پێی هاتوون، لە ئادەمەوە تا موسا و عیسا و بۆ موحەممەد (درورد لەسەر هەموویان بێت).

چەندین پەرتووکی بە نرخ دەربارەی قورئان و زانستی سەردەم نوسراون و چەندین توێژینەوەی تریش کاری لەسەردەکرێت. إن شاء الله ئەم توێژینەوەیەش یارمەتیدەرێك دەبێت بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی زیاتر نزیك ببنەوە لە وتەکانی پیرۆزی الله. ئەم نامیلکەیە تەنها بەشێکی کەم لە بەڵگە زانستییەکانی ناو

قورئانی لەخۆگرتووە. من ناتوانم ئەوە بڵێم تەواو دادگەرییم کردووە لە بابەتەکەدا.

پرۆفیسۆر (Tejasen) بوو بە موسڵمان تەنها لە ژێر کاریگەری یەك نیشانەی زانستی کە لەقورئاندا باسکراوە. هەندێك کەس لەوانەیە پێویستیان بە دە بەڵگە هەبێت لەکاتێکدا هەندێکی تر سەد بەڵگەیان پێویستە بۆ ئەوەی بۆیان بسەلمێنێ کە قورئان وەحی خودایە. بەڵام خەڵکی تر هەیە کە ئیسلام پەسند ناکەن تەنانەت ئەگەر هەزاران بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە. قورئان ئەم بیرداخراوانە لەم دەقەدا باس دەکات:

﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ البقرة،واتە : ئەوانە کەڕن لاڵن کوێرن، ناگەڕێنەوە (بۆسەر ڕێگەی ڕاست).

قورئان کۆدێکی تەواوی ژیانی تێدایە بۆ تاك و کۆمەڵ. الحمدلله، ئەو ڕێگەیەی کە قورئان دایناوە بۆ ژیان بە پلەیەکی زۆر لەسەرووی هەموو ئەو سیستەم و مەنهەجانەوەیە کە مرۆڤ دایناون ............ کێ دەتوانێ ڕێگەیەکی باشترمان نیشانبدات لەوەی کە بەدیهێنەر خۆی دایناوە؟

هیواخوازم کە خوای گەورە ئەم هەوڵە بچوکەم لێ وەربگرێت و داوای بەزەیی و ڕێنمویی لێ دەکەم

# ناوەڕۆک